کۆماری عـیراق
وەزارەتی رۆشنبیری وڕاگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری وبلاو کردنەوەی کوردی
زنجیرەی زمان (٤)




# کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردیدا

رؤوف احمد ئالانی

کۆماری عیراق
وەزارەتی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندن
دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی
زمانەوانی - ٤ -

# کێشەیەک
# لە ڕێزمانی کوردیدا

## پاشگرو نیشانەی
## ەوە // وە

ڕەئوفی ئەحمەد ئالانی

# پێشەکی

بەناوی ئەرکی نەتەوایەتی ، لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی و سازدانی ڕێزمانەکەی •• بەرەوپێش تەکاندەدا •• ئەم کارە زانستیە زمان دۆستانی کەمەندکێش کردوە ، لە سەرجەمی کۆششیانەوە ئەو خەرمانە هەڵدراوەتەوە کە یەکێ بینە ، شەنوکەو بکرێ ••

یەکێك لەو بابەتانەی کە لە ساڵی ۱۹۷۳ ـ وە بەچڕی لەسەری نووسراوە مۆرفیمی(۱) [ ەوە / وە ] بوو . جارێك بەناوی پێشگرو جارێکی دی بە ناوی پاشگرو تێوبەتێویش بەناونیشانی هەردوکیان سەری هەڵدەدایەوە ••

بەش بەخۆم پتر لە سەد لاپەڕەیەکی سەربەئەو مۆرفێمەم ـ لەم گوتارو لەو گوتاردا ـ کەوتەبەرچاو ، ئەمەش بێجگە لە چەند نووسینێکی لەوەوبەر، کە بەکورت بڕییەکەوە یان لەمیانی ئەم باس و ئەو لاباسدا هێمای بۆکراوە •• تا لە دواییدابوو بەکێشەیەکی نەپساوەی دوورئەنجام •• لەپاڵ ئەو ورووژانەدا چەندان دەستووری وشەسازی و دەنگسازی بەرەنگاری شێوان بوون ••

بێ گومان لەو هەموو ڕاجیاوازانەدا ، داسەپاندن •• وردەکاری •• بەراوردی بەجێ و نابەجێ •• ڕواڵەتکاری •• ڕاگۆڕکێ •• بەناوی لێکۆڵینەوە یان ـ بەبێ لێکۆڵینەوە ⟵ هەموویان بەیەکداچوون •

(۱) مۆرفێم :ـ بچووکترین دانەی واتادار ی زمانە .

هۆی ئـەو ئاڵۆزکـانـەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەچاونـەکـردنی ڕێگای پشکنینو بەراوردکاری ••

پتر لە دووساڵ بوو بەگرێ لە دڵمداو بەنیازی ئەنجامێکی سـەرومڕ باوەشم دەکردەوە بۆ نووسینەکانو بەشوێنیاندەکەوتم •

بیرم لەوە کردەوە هەر بچێنینو بژارەنەکرێ یان نەیدرووینەوە ، نە خەرمانمان بۆ سووردەکرێ و نەجێ پەرێزیشمان پاکژدەبێ •

قەناعەتیشم بەوە هەیە کـە بەرهەمی زمانـەوانی لـەنێـو جەماوەری ڕۆشنبیرانماندا جارێ ئەو ڕمێنەی‌نیە •• لەگەڵ ئەوەشـــدا بۆ ئێمەی زمانکەلەلا ، ئیشێکی مەزنترە لە لایەنەکانی‌دی ، کە ئەوەنـدە بەندیواری سنووری ئەکادیمیانەنین ••

زمانی هەر نەتەوەیەک بێتو بەبێ دەستووری تایبەتی بەرڕەهابێ وەک گەلەیەکی بەبێ شوان ئاوەکیو تەفروتونادەبێ •• دواتر زمانی‌نووسـینی سەرناگرێ •

ئاشکرایە کە ئەم لایەنە زانستیانە پێویسـتییان بەیەکالا هەیەو لـــە ڕێگەی بەرەنجامیو پشـــــکنینەوە نەبێ ، بەلێڵیو دژواری دەمێننەوە ، ئەمەش لەخۆیدا سەختو گرانە •

بەخواستی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیانە پێویستە نووســــینەکانی لەمەڕ ئەو بابەتە بخرێنەوە ڕوو •• دەســـتپاکانەش هەڵبسەنگێنرێن •• دواتر ئەوداڵو سۆراخ لە لقوپۆپی زمانەکەماندا •

هەرچەندە پارســــەنگی ئەم کتێبە بەلای مۆرفیمی [ ەوە ]دا ، ســــــلاودەدانەوە بەلام شـــڵەقانەکە لـە تێچڕانی دوو لایەنی دیکەوە

بەرپابووە[1] وەك لەمەولا دەردەکەوێ ئەرکەکەم دەبێتە سێ لانەو زنجیرە بەندی لێکۆڵینەوەکە ، دووچاری لادانو پسانەوە دەبێ •

ساغ کردنەوەی ئەو مۆرفێمە[2] یان گێڕانــەوەی بۆ تەوەری خۆیو بەخواستی زمانە ئەدەبیەکەمان ، بەستراوە بە ساغ کردنەوەی نیشـــانەی کاری رابوردووی نزیكو پاشکۆی هەندێ پریپۆزیشنەوە •• هەرسێکیان ـ لە هەندێ هەرێمدا ـ لەیەك رووخسارو قەبارەدان ، هەریەکەشـــیان ئەرکی تایبەتو جیاوازی هەیە ؛ ئەمەش گەشتێکی چالاکانەی دەوێ لــەم هەرێمەوە بۆ ئەو هەرێم ، بەپێی هەڵکەوتی شێوەو دەستە شێوەکان •

با لەرێوە خوێنەران لە نیازم بگەن : مەبەستم ئەوەنیە کــە رێزمان بۆ رێزمان بێ ، یان بەرەو رێزمانێك هەنگاوبنێین کە هەموو شـــێوەکانی پێ دابین بکرێ ، ئەمەیان سۆزکارییەکەو نەسەری گرتووەو نەســـەریش دەگرێ •• یان ئەوەندە رێســـەخوازنیم کە تاقــە مۆرفێمێك یان تــاقە وشەیەك بەچەندان رووخسارو فۆرمی دوورو نزیکەوە جەڵەبکەم لە پێناوی

---

(1) کارەکە هەر بەئەوەندە ســـەرناگرێ کە بگوترێ و بنووســـرێ [ ڤە = Ve ی Prefixus ـ و We ی Sufixus .

ئنجا بەوەندە وازبهێنینو بڕیاربدەین کە ئەو دوانە هــەر بەئــەو فۆرمەن ... ئەویان بۆ سەرتاپای کرمانجیی سەروو ، ئەمیشـــیان بۆ تێکڕای کرمانجیی خواروو !!

(2) بەکوردیی پەتی نووسین ، نیشـــانکردێکی پیرۆزە . کەسیش ناتوانێ بەرانبەر بە کۆچوڕەوی دیاردە شارستانیەکان بوەستێ .. زاراوەش بەشێکە لە هەمان دیاردە .. جا بۆئەوەی کە لایەنی زانســـتیم لەکیس نەچێ ، ناچارانە زاراوەی دەرەکی بەکاردەهێنم : ـ جارێ ئەوە ســـاغ نەبووەتەوە کە [ ەوە / وە ] پاش گرن یان نــا ؟ لــە عــەرەبیو کوردیــدا بەرانبەر بە ( مۆرفیم ) وشەیەکی پڕاوپڕ نەچەسپیوە .
یان بۆ ( پریپۆزیشن ) زاراوەی ( ئامرازی پەیوەندی ) تایبـــەت نیە و مەبەستەکە نادابەدەستەوە .

• مۆرفێم : مەبەست لەمۆرفێم ـ بچووکترین دانەی واتادارە،ئەوەیە کە ناتوانرێ بچووکتر بکرێتەوە بەمەرجێ واتای نەفەوتێ . بەوێنە وشەی ((مۆسدان)) لەدوو مۆرفێم ((مۆم + دان)) دروست بووە و هەر یەکێك لەو مۆرفێمانە

یەك تاقە مەیەســــتدا • ئەوەی‌کە لـــە باوەڕی مندا چەکەرەی‌کردبێ ، دەست‌نیشان‌کردن‌و هەڵهێنجانی کەرەســـــەی کـامڵەو لـە پێناویـدا هەڵپشکنینی لقوپۆپی زمانەکەمانەو لەو سەریشەوە گەوهەربەندی زمانی پەسندکراوی نووسینمانە بە ئەندازەی پێویست •

لەنێوان زمانی نووسین‌و زمانی قسەدا ڕێژەی تایبەت‌و گشـــــت هەیە ؛ ئەوەی‌کە دەنووسرێ دەبێ کوردی‌ی‌واتەنی بێ ، هەموو کوردی‌ی واتەنییەکیش بە زمانی نووسین دابین ناکرێ •

ئەو ســــنووره ناشکێنم‌و بڵێم : ئەوەی لە بارەی ئەو مۆرفیمانەوە گوتراوە سەرجەم ناهەموارە ، یان زۆربەیان زانســـتانەن یان ئەوەی من بۆی‌دەچم بنەبڕە ، ئەم حوکمە دەدرێتە دەست‌دادگای زمانەوانی •

ئەوەندەم بەش‌پێوەهەیە کە بە ڕێگای بەراوردکاری‌و بەرەنجامیـــدا مل‌بنێم ، مەسەلەکە زانستەو ئارەزووکاری ناگرێتەخۆی •• وەستایەتی لە زماندانیە هەر ئەوەندەمان لێ‌دەوەشێتەوە ، وشـــیارانە لێی‌هەڵبهێنجین‌و بی‌خەملێنین • بڵێم‌و نەڵێم ـ لە زەق‌بوونەوەی بڕێ بۆچونـدا ـ نابـەدڵی سەرپێوەدەنێ ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کـــە لـە شکۆی بۆچوونـەکـــان کەم‌بکانەوە ؛ کەسمان مافی ئەوەی‌نیە کـە لـە سـەرجەمی زمانـەوانیـدا مامۆستای بالآبێ ؛ نەپێکانی لایەنێك نابێتە بەڵگەی بۆنەچوونی نووسەر لـــە هەموو سەرێکەوە ، کاری هەمووشمان هەوڵێکی ســـەرەتـاییـە • لەوەش بەئاگاین کە بەبێ دەستووری چەسپاو چاك‌وخراپ دەقۆزرێتەوە ، بەتایبەتی لە هەندەرانەوە ، دوای ماوەیەك هەڵە ڕۆیشـتووەکان ، لە ڕکێفی بەســــەرکردنـەوەدا نـابـن ••• یـان وا بـەئـاســـانی لە قوڕگیان دەرناهاوێژرێنەوە •

هەر وەکو بۆ بەربەستی رای نادروست دەڕەتێم ـ کە نەبنە خۆرە لە قەدی پیرەداری زمانەکەماندا ـ لە چەندان نیگاو تروســکەوە ، سرووش وەردەگرم •

بەنەوازشەوە دەڵێم :ـ تۆبەرەیەکە لە لێکۆڵینەوەی زمانیکوردیدا ••• ئەگەر ئەو قســـــەیەشم لێوەرنەگیرێ ، ڕۆژنەیەکە لە وشەســـــازیی کوردیدا •• بوومە سەرگەردی سرکترین بابەت لە کەرەســـــەی ڕێزمانی کوردیدا ، تاکانە ماکزایەکی ئەمپەڕاوپەڕی زەمینەکەمانە •

سەرباری هەموو تەگەرەو ئازارێك بۆ جاری دوەم تێهەڵچوومەوەو خستمەوە سەر ئەو ڕێنووسەیکە بەحسم لەسەر داناوە •

ئنجـا تاچ راددەیـەك خزمـەتم بەجێهێنـابێ ، خۆتـانو دادگـای ویژداتتان ••• قریوەی سەرفرازیش ئاواتی هەموانە •

ئـالانی



## نماییشـــــێك

با لەسەرەتاوەو بە کورتبڕییەکەوە بە زۆربەی ئەو نووســـــــەرو زمانەوانانەی لەم بوارەیان داوە ئاشنابین • ئەمیش وەك ڕۆژنەیەك بۆ ئـەو زمان دۆستانەیکە شەیدای لێکۆڵینەوەی زمانی کوردین •

١ ـ لە گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورددا[٤] ( د• نەســـرین فەخری ) بەسەرباسی « ـ پێشـــگرو پاشـــگری / ڤە = وە ، گـوتـارێکی نووســـــیوە ، کە پەرەپێـدانی لێکۆڵینـەوەی زانستانەی نامـەی

(٤) ژ (١) ب (١) ل ٢٣٤ ـ ٢٦٨ ، «٣٤» لاپەرەی بەشی کوردیەکەیەتی •

دوکتۆریەکەیەتی ، بە رەخنەوە رای هەندێ لە زمانەوانەکانی خۆمانو هەندمرانی تێدادەست نیشان کردوە .

٢ ــ مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ــ لە وەڵامی بەشە رەخنەکەی خۆیدا ، گوتارێکی بەسەرباسی « پێشگرو پاشگر » لە هەمان گۆڤاردا ، بلاوکردوەتەوە[٥] .

٣ ــ لە بەرگی سێیەمیشدا ، دیسانەوە « عمید أحمد حسن » بە هەمان سەرباس بە شوێن دوو گوتارەکەی ــ د. نەسرینو مامۆستا خاڵ ــ کەوتوە . ئەو واتەنی ــ لە کۆمەڵە پیتی / ەوە / دواوە[٦] .

٤ ــ د. پاکیزە رەفیق حیلمی ــ لە نێوان باسەکەیدا « بووژانەوەی زمان » لە بارەی فۆرمو ئەرکەوە ، بە کورتەیەك لێی دواوە . بەچەند نموونە شیکردنەوەیەکی تایبەتی ، قاڵبەچاوگە ریشەییەکانی ، رەگەڵ مۆرفێمی [ وە ] خستون[٧] .

٥ ــ مامۆستا مەسعوود محەمەد ــ لە میانی رەخنەیەکی تایبەتیدا ، پەراوێزێکی لێ داوەو تیشکی خستوەتەسەر هەندێ لایەنی ئەو مۆرفێمەو هێشتا لێی دڵنیانیەو هێشتویەتیەوە بۆ لێکۆڵینەوە[٨] .

٦ ــ مامۆستا تۆفیق وەهبی ــ لە نامیلکەکەیدا ( دەستووری زمانی کوردی ) ناراستەوخۆ ، چمکێکی لێداوە بە دەستەوە ، کە دەڵێ : « تربط کلمة التعلق « ئە » و آداة « ەوە » بآخر الفعل ... الخ[٩] .

---

(٥) ژ ــ ٢ ــ ب ــ ٢ ــ ل ٢٥٦ ــ ٢٧٥ . دیسان هەمان گوتاریان بە نامیلکەش بۆ بلاوکردەوە .

(٦) هەمان سەرچاوە ل ٣١٩ ــ ٣٥٠ = ٣١ ــ لاپەڕەی کوردیەکەیەتی .

(٧) گۆڤاری کۆڕ ، ژ ــ٣ــ ب ــ١ــ ل ١٤٣ ــ ١٩٠ .

(٨) هەمان سەرچاوە ، ژ ــ٣ــ ب ــ٢ــ ل ١٦٠ ــ ١٦١ .

(٩) بەرگی یەکەمی کتێبەکە . ل٣٥ ــ الفصل الخامس ، الاختصار .

٧ ـ مامۆستا نووری عەلی ئەمین ـ لە کتێبەکەیدا « بۆگرتنی کەلێنێکی ترلەڕێزمانی کوردیا » نووسیویەتی : « پاشگری / ەوە ، وە ، یەوە ، رەوە ، تەوە .... » بۆ هەر یەکەیان ژمارەی سەربەخۆی داناوە[10] .

٨ ـ خوا لێخۆشبوو ( مامۆستا سەعید سیدقی کابان ) نووسیویە : « وە » بۆ تەکرارە ، بەمەعنا دووبارەیە ، بە ئاخری کەلیمانەوە دەنووسێ ، وەکو ـ ئەحمەد هاتەوە ، ... چوومە ماڵەوە ، وەئەداتی مازیی نەقلیە ، وەکو ـ جەمال هاتۆتەوە[11] .

رای چەند زمانەوانێکی دی ، کە ـ د. نەسرین ـ لە گوتارەکەیدا ناوی بردون وەك :

٩ ـ د. قەنات کوردۆیێف :

« پاشگری ـ ەوە ـ بەمەرجێك بەدوای ئەو وشانەوەبێ کە کۆتاییان بە حەرف ساکن بێ »[12] .

١٠ـ د.ن مەکەنزی :

پاشگری [ ەوە ] هەندێ جار بەشکڵی [ وە ] دەردەکەوێ .

١١ـ زانای ئەمریکی ( ل . ئۆ ـ فۆسوم ) : بەرانبەر بە پاشگری [وە]ی شێوەی خواروو ، پێشگری « ڤە » هەیە لە شێوەی کرمانجیدا .

١٢ ، ١٣ ـ د. کەریم . پ . ئەییوبیو د. ئی.ئا سمیرنۆڤا : « لەشێوەی « ەوە » دا ، وەك پاشگر باسیانکردوە »[12] .

---

(١٠) پێشگرو پاشگر ، چاپی ( ٩٥٨ ) ل ٣٥ .

(١١) مختصر صرف و نحوی کوردی چاپی ( ٩٢٨ ) .

(١٢) هەردووکیان : شێوەی کوردیی موکری . لێنینگراد ، ساڵی١٩٦٨ ـ ل ١٠٢ . / بە پێی پەراوێزەکە ئەمانە هەر ئەوەندەیان لێوەرگیراوە .

١٤- لیژنەی زمانو زانستەکانی ، کۆڕی زانیاری :

« چ مانیعێک نیـە لەوەدا بگوترێ پاشـگرەکە تێکرا [ ەوە ] یـە ، یا بەدوای پیتەبزوێنیشەوە بێ[١٣] .

١٥- دووبارە هەر لیژنەی زمانو لە هەمان کتێبدا :

لە بارەی نیشـــانەی کاری رابـوردووی نزیکەوە دواون ، بۆ چوونەکەیان تازەبابەتە .

١٦- خوا لێ خۆشبوو ( ئایەتوڵلای مەردۆخ ) :

لە لاپەڕە « ٢٤ » ی بەرگی یەکەمی فەرهەنگەکەیدا هـەر ئەوەندەی نووسـیوە : « پیتك دووبارە ـ و ، وە ـ هاتو ، هاتوە . لە بارەی نیشانەی رابوردووی نزیکەوە ؛ لە خشـــتەی لاپەڕە پازدەدا نووسیویەتی :

« بگردگ دوور ـ بوگە ، هاتگە ـ » .

١٧- مامۆستا جگەرخوێن : بە شێوەیەکی جیانەکراوەو رووخسـارانە لـە مۆرفێمی [ وە ] دواوە[١٤] .

١٨- دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف ؛ دەڵێ : « لە زمانی کوردیدا دوو پاشگر هەن کرداری داڕێژراو دروسـتدەکەن : ـ ەوە / وە ـ ڤە ـ پاشان چوار واتای بۆ دەستنیشاندەکا[١٥] .

---

(١٣) رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ل ١٧٧ ـ ١٧٣ ، دیسان ل ٢٣٨ ـ ٢٤٢ . چاپی ٩٧٦ .

هێنانەکایەی نیشانەی رابوردووی نزیك باری ناچاریـە ، وەك گوتم ئەم بەحسـه ناتوانێ دەسـتبەرداری ببێ ؛ لەمەولاش دەردەکەوێ .

(١٤) ئاواو دەستوورا زمانێ کوردی ، ل ١٤٠ ـ چاپی ٩٦١ . بغدا .

(١٥) وشـەرۆنان لە زمانی کوردیدا ، لاپەڕە ٧٩ ـ چاپی کۆڕ ـ ٩٧٧ .

١٩- لیژنەی زمانو ئەدەبی کوردیی پۆلی شەشەمی ئامـادەیی ( ل١٥ — ١٩٧٦ ) بە نیو ناچلییەکەوە لە نیشانەی رابوردووی نزیك دواوەو لەمیانی خشتەیەکداو روالەتانە دوولەتی کردوە •

٢٠- مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی - نووســـــیویەتی : « ڤە » زۆر جیـــاوازە ، لە / ەوە / چونکە ئەویـــان پێشـــــبەندەو ئەمیـــان پاشبەندە »[١٦] •

٢١- دە جـەمـــال نـەبـەز : لــــە مـۆرفێمی دووبـارە دواوەو دەلێ :
« پێشکۆی ڤە = ve و پاشکۆی وە - we »[١٧] •

دوای ئەو نیسچە بیبلۆگرافیایە ، ئەوەم لەخۆم گرتوە ، کە پێم بلێن :
« کابرا ! شتێکی رەقاوە دەکوتێتەوە ! » •

نووسینەکان هەرچۆنێك بن ، لـە رووی خزمـەتـەوە ، پێش وازیان لێدەکرێ • ئـەوەی لافی ناوازەکـاری لێبـدا ، ئـەوا لــــە کـەژاوەی زیندەخەودا جۆلانەدەکا !!

تێکڕا هـەموو کارێك لایـەنی هـەمـوارو نـاهـەمواری بـەبالای خۆی بڕیوە •• گومانم نیە کـە برێ لەو زمانەوانە بەرێزانـە بێتو بهـاتـایەماوەیەك خۆیـان بۆ ئـەو مەسـەلەیە تەرخانبکردایەو بۆی بڕەنجانـایـە ، بەرهەمێکی پوختتریان بەدیدەهێنا •

لایەنی دەســـــتوور شێوانو چەندان موزاعەفات لـــە ســـایەی نووسینەکانی سەر بە ئەو مۆرفێمانەوە ، جەدەلێکی نەپســاوەی سـازدا ؛ ئەمەش تاوی دام کە رێگەی پشکنینو بەراورد بگرمەبەر •

---

(١٦) ســـــەرەتایێك لـە فیلۆلۆژیی زمـانی کوردی • ل ١١٢ ، ١١٨ • چاپی ٩٧٣ •

(١٧) زمانی یەكگرتووی کورد ، ل ٢٩ - ٣٠ ، چاپی ~~بەرلین~~ بامبێرگ ١٩٧٦/٦/١٦

## قۆناغی یەکەم

### ـ هەنگاوی یەکەم ـ

هەڵسەنگاندنو بەراوردێکی چڕە
لە نێوان چەندان نووسیندا
دەربارەی فۆرمو هەڵکەوتی
مۆرفێمی دووبارەو بەردەوامی

## — ١ —

# هەڵسەنگاندنی زنجیرە نووسینێک لەبارەی ~~فۆرمی~~ مۆرفێمی « ەوە[١٨] »ی دووبارەوە

ئەوەی‌کە زەینی خوێنەر پەرت‌دەکا بەدی‌نەکردنی دەربازگەو نیـازی نووسەرە ، جا هەر نووسەرێك‌بێ • کەواتە چەند پرسیارێك :

— خاڵی بەرایی نووسینەکان لە میانی چ باسێکەوە سەری‌هەڵداوە ؟

— هەڵسەنگاندنی لاباسـەکان تا چ رادەیەك پسـانەوەو دژواری پەیدادەکەن •• ؟

— حوکم‌دان ، ئنجا پاساودان = تعلیل ـ یان بە پێچەوانەوە •• ؟!



## — ١ —

❋ دوکتۆر نەسرین فەخری ، چۆنی بۆچووە ؟

---

(١٨) ئەرکی ئەو مۆرفێمە تەنها « دووبارە کردنەوە » نیە ، هێشتا کەسمان نەگەیشتوەتە سنوور بۆ دانانی سـەرجەمی ئەرکەکانی . لەلایەکی دیکەشەوە لە ناوبردنیدا ، دەشێ کورتـە ناونیشـانێك وەربگرێ .. لەبەر ئەوەی‌کە پتر بە « ەوە »ی دووبارە ، ناودێربووە ، منیش لـە هێنان‌و بردنیدا ، پتر بە « مۆرفێمی دووبارە » ناوی دەبەم .

یەكسەر بڕیاریداوە : كە مۆرفێمی ناوبراو بڕیتیە لە بڕگەی « وە » بە قیاس لەسەر « ڤە »ی پێشگری كرمانجیی سەروو •

بزوێنە بەراییەكەشی ـ حرف ربط ـ ەو بۆ جیاكردنەوەی دوو كەرتە دەنگە •

— یادگارێكیدی هەیە كە چاوگی بێواتایە[19] ، بەراددەیەك تێكەڵكێشی ئێرەی كردوە ، مەوزووعێتمان لێسەختگیر دەكا •

— دەڵێ : بەداخەوە دەورەگرنگەكانی ئەو پاشگرەو تایبەتەكانی لەلایەن زمانەوانانەوە رووننەكراوەتەوە ، لەباتی ساغكردنەوەی ، رواڵەتەكەشییان تێكداوە !

— لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا نووسیویە ـ: « پاشگری « ن » ی « خەون »و « ە » ی « كوشتە » و « وو » ی « نووستوو » ، لەوانەیە ئەم پاشگرانە كورتكراوەی بڕگەیەكبن یان وشەیەكبن••• پێویستیان بە لێ كۆڵینەوەیەكی قووڵهەیە »[20] •

**سەر بەخاڵی یەكەم :**

ئەو هەوڵە سەرەتاییانەیكە تا ئێستا دراون پتر لەبارەی كۆكردنەوەو كەمەجیاكارییەكی شكڵیو رواڵەتانەدا بووە ، بە پێی ئەو روخسارانەی كە لەردمەكیی دەربڕینو قسەوە دەركەوتوون ، ئەگەر تایبەتیانەش نەبووبێ ، تا راددەیەك خاسیەتیان دەستنیشانكردوە ••• ئەوەی كە تا ئێستاش

(19) واتە ـ چاوگی كوێرەوەبوو ـ لە دووتوێی كتێبدا ، چاپی بەغدا ـ ١٩٧٣ ـ سەدو دوو لاپەڕەیە . هەوڵدانێكی پەسندەو بژارێكی چاكی گەرەكە .

(20) ئەم لاباسەی بۆیە هێناوەتەوە كە بەتاوی بڕگایەتی پێمان بسەلمێنێ ، هەموو مۆرفێمێك وشەیەكی سەربەخۆبووە ، ئەم نیگایەشی ـ كە قسەیەكی رەبەقە ـ سەربەنیازێكی تایبەتیە ، وەك لەمەولا دەردەكەوێ • مجرد ( رووت )

کنەی تێدادەکرێ ، بارێکی ئەوتۆی لە مەسەلەکە نەگۆڕیوە ، هۆی ئەمەش زۆرەو چەندان بەحسو رووڵیهەڵمالینی دەوێ .

**سەر بەخالی دوەم :**

ئەگەر ئەمەی لە سەرچاوەی سەر بەهەندێ زمان وەرگرتبێ ، نازانین نەزەریانەیە یان زانیارییەکی تەرەفدارانەیە ... ؟

ئەم گومانە لە زمانێکدا دەبرێ کە گەردان دەوری بەتەوژمی تێدانەبێ ، یان کەمترپشت بە نیشانەو ئامراز ببەستێ ، لەم بارەیەوە برێ زمان دەستنیشانکراون[21] .

بەڵام زمانی کوردی لە پڕ ئامرازیو نیشانەدا ـ وەك دیاردەیەکی خۆکرد ـ ئەوپەڕی چڕی بە خۆیەوە دەبینێ ... !!

لەوەش بە ئاگاینکە فرەجیاوازی هەیە لە نێوان کۆمەڵەی ئامرازو نیشانەو پێشگرو پاشگردا ، هێشتا بۆ هەڵهاوێردنیان ـ بەکردەوە ـ هەر لە دەمەقاڵێدایین .

مطلقاً

بەڵام بۆ پاشگر لەو نموونانەدا کە هێناونیەوە ، بەڕەهایی ناسەلمێنرێن .

تا ئێستا هیچ پسپۆڕێك ( لەکوردان ) بەدڵنیاییەوە ئەوەی بۆ ساغ نەکردوینەوە ، کە وێنەی « ن » ی « خەون » وەك پاشگر لە

---

(٢١) بۆ ئەو زمانانەیکە پشت بەو لایەنە نابەستن « رووسی ، تورکی » دەستنیشان کراون . ئەوەیکە من لێی بە ئاگابم ئەم سەرچاوەیەیە :
ـ اصوات واشارات ـ ا . کوندراتوف ـ ل ١٧٨ ـ ترجمة « أدورد یوحنا » دەڵێ : في علم اللغة
« فکلتاهما ـ والحمد لله ـ لا أدوات لهما » . بغداد ١٩٧١

فلاّن بڕگه یان فیسار وشه‌وه ، دابـه‌زیـوه ؟! یان / ـوو / ی « بردوو » ڕۆژێ له ڕۆژان وشه‌یه‌كی سه‌ر به‌خۆ بووبێ ... ؟

ئه‌م جۆره بیرو ڕایانه ڕێزمانـه‌كـه‌مـانی تووشی ئاژاوه‌كردوه ، وه‌ك بۆچوونی بڕێكمان ته‌نها له ده‌ربازگه‌ی لكێنی = الصاقي ـ یه‌وه ، بڕێكی دیكه‌مان بۆ باری داتاشین = اشـــتقاق ـ یان به‌یه‌كـــدادانی هه‌ردوولا به‌بێ‌جیاكاری له زاوزێی وشه‌ی ناهه‌مواردا .

مه‌رج نیه كه سه‌رجه‌می پاشگر له زمانی كوردیدا بڕگه‌ی ته‌واو یـان وشـــه‌ی سه‌ربه‌خۆ بووبن له تاودانی ئه‌و نه‌زه‌ریه‌وه چه‌ندان ده‌ســتووری ناساز بێنه وشه سازیه‌وه . به‌سروشتی دواپینه ، مۆرفێم وه‌ك خۆكردێك له زمانه كه‌مانـدا ـ جۆش ده‌خـوا ، ئه‌گـه‌ر جووتـه بـزوێن بـه‌ره‌نگاری یه‌كدی‌بوون ، زمانه‌كه‌مان ڕێگه‌ی بۆ دڕداون .. به‌تێ‌چوون‌و ترازانـدن له‌سه‌ر دووپاسای زیندووی به‌كار ، له ڕووی چۆنێتیشه‌وه ، هه‌ر شـێوه‌و ده‌سته شێوه ( دیالێكت )یه ، كارتێ‌كرانێكی تایبه‌تی هه‌یه :ـ

أ ـ ئه‌گه‌ر لابردنی یه‌كێكیان ئالۆزه‌زمانی = ملابسة لغوية ـ په‌یدانه‌كرد ، یه‌كێ له دوو بزوێنه‌كان تێ‌ده‌چێ ، بۆ ئه‌م پاســا به‌كاره نمونه‌مـان زۆرن ، وه‌ك :

١ ـ په‌نجـه‌ره ـ ه = په‌نجه‌ر + ان = پـه‌نجـه‌ران . بـه‌تێ‌چوونی بزوێنی « ه » .

٢ ـ بـرژان ـ ن بـرژا ره‌گی رابـووردوو + اندن = برژانـدن . بـه تێ چوونی « ا » ی « انـدن » نـه‌ك « ا » ی « برژا » ، چونكه هه‌مان « ا » ی برژا له ڕانه‌بوردوودا ، ده‌بێتـه « ێ »

وەك : ( من دەبرژێم )[٢٢] •

٣ ـ گرمە + اندن = گرماندن • بەتێچوونی بزوێنی یەکەم •

ب ـ ئەگـەر تێچوونی هـەر کامێکیـان دەبـووە هۆی ئـاڵۆزە زمـانی ، دپارێزرێن و زمانەکە خۆی وەستایەو « تێوبڕ » دەسـازێنێ بەپێی چەشە ئاوازی تایبەتی ، لێرەدا ناوچە تا ناوچە خۆی سەرپشـکەو دەنگدارێك دەکاتە نێوان[٢٣] •

**بە نموونـە :**

١ ـ هات + وە + ت + ەوە •

٢ ـ شاری + ان • بە هەڵچەرخانـەوەی بزوێنی « ی » بە زەبری « ا » بۆ دەنگدارو رای‌کردنی دەنگی « ر » بە نیمچە ژێر « i » لێرەدا پێتو ئەو هاوکێشانە ، نەبن ، بەوێنە « شاران » کە کۆی « شـار » ە ، لەگەڵ « شاریان ، شارییان » کە رێژەناوە دەئاڵۆزکێ •

لەوانەیە ئەم قسانەم بەکوتانەوەی شـتێکی ساکار بدەنە قەڵەم •• بـەڵام وەك بنکەیـەکی پەیـڕەوکـراو لێی‌نـەدواونو فـەرامۆش‌کراون • لە میانی رەخنەکاریی خۆمداو لەم چەندسـاڵانەدا ، ئەو لایەنەم بۆ

(٢٢) مامۆستا مەسـعوود محەمەد : ( چەند ، حەشارگەیێکی رێزمانی کوردی ل ١٨ ـ ١٩٧٦ ) وێنەی ـ١ـی ( برژا ، ترسا ) بە پاشـگر دادەنێ . ئەو زەکای خۆی بەکارهێناوە . بەر لەدەرچوونی ئەو کتێبە، بە رای‌خۆم ئەم نموونانەم شی‌کردونەوە بەلای منـەوە گۆڕینەکـە سـەربەگەردان ( اعلال )ە واتە هەر « ا »ی قەدە چاوگەکـەیەو دەگۆڕێ بە « ێ » ئەگەر « ا » پاشگر بێ ناتوانین تێـکڕای « ان »ی ( برژان ) بە نیشانەی چاوگ دابنێین .

(٢٣) مامۆستا تۆفیق وەهبی ، بەرانبەر بە « ئێنفۆنیك » ، «تیپە ئاهەنگی» پێشنیازکردوە ـ بەلای منەوە « نێوبڕ » خراپ‌نیـە ـ . گـۆڤـاری کۆڕ ـ ژ ، ب ١ ـ ل٢٨ .

ئاشكرابوو ، كـه زوربـەی هێنـانوبردنو شـێوان لـە وشـەسازیدا ، جەمسەرەکەی بەندە بەلادانو هەستپێنەکردنی ئەو دوو بنکەیە ، لەمەولاش دەردەکەوێ ٠

**پوختەی بۆ چوونەکەی :**

١ ـ لەدوای ( حرف صـحیح ) پاشگرەکەیان لە رواڵەتی « ەوە »دا ، بەرچاوکەوتوە ٠

٢ ـ مامۆستا خاڵ واوێکی لەنێوان دوو ( هـ ٠٠٠ هـ ) داناوە ٠

٣ ـ مامۆستا نووری عەلی : پاشگری « وە » کە بەدوای ( حرف علە ) وە بێ ٠ قەنات کوردۆیێف هەر وادەڵێ ٠ ئەوانەو چەند زمانەوانێکی‌دی کـە بەگلەییەوە ناوی بردون ٠ ئنجا دەڵێ : « بەبێ ئـەوەی هیچیان جیاوازی ئەم دوو رواڵەتە جیابکەنەوە »[٢٤] ٠

## هەڵسەنگاندنێک

د. نەسرین

ئەوەی‌کە دەستم پێدابگا ـ لەو گوتارانەی نووسەر ناوی هێناون ـ پێویستە دەورێك‌بكرێنەوە پوختەی وەلامـەکـەی خـاڵ ، ئـەوەی‌کـە پەیوەندی‌ی بە قەبارەو روخساری پاشگرەکەوە[٢٥] هەیە :

---

(٢٤) بۆ لاپەڕە ـ٢٤٣ـی هەمان سەرچاوە کە پەراوێزی لێداوەو دەڵێ :ـ « پاشگری ـ وە ـ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئامرازی ـ وە ـ دا ، هەندێك بەبێ لێکۆڵینەوە بەیەکیان دادەنێن ، بـەلام ئەویـان پەیوەنـدی بـە مۆرفۆلۆگیاوە هەیەو ئەمیان سەر بە سینتاکسە ، بە هەردووکیـان گرامێر پەیدا دەکەن » تائێرە .

ئـەم پەراوێزە وەك گرێیەك بەجێدەهێلم تـا لـە شوێنی خۆیـدا دەکرێتەوە . ئالانی

(٢٥) گۆڤاری کۆڕ ، ژ ـ٢ـ ب ـ١ـ ، ل٢٥٦ .

١ ـ پاشگرەکە [ ەوە ] یە • جا خوایدەکرد بزوێنەکەی پێشـــــەوەی بنەڕەتی دەبوو یان پیتی پەیوەند دەبوو •

٢ ـ بیانووی ـ د• نەسرین ، گوایــە کــە بەدوای « حرف علـە » وە بێ بزوێنی بەرایی ناوێ ، بـەتـالی دەکاتـەوەو بەنموونـە ( نـەك بـە شیکردنەوە ) چەند قالبێك پیشاندەدا ، وەك :

ـــ سووتا ، برژا = سووتایەوە ، برژایەوە ـــ •

٣ ـ ئەگەر بەروخساری « وە »ش بێ ئەوا لە ناوچەیەکی بچکۆلانەدایەو دەستووری لەســـەردانانرێ • ئەمە تائیرە • بـەڵام لێکۆڵینـەوەی زانستی ، پشت بەو قسە رەبەقانە نابەستێ •

* پێویستە کە قسەمان لە هەر نوسینێکەوە گواستەوە ، لەنیازی نووسەرەکە بەئاگابین •

بۆم دەرکەوت کە مەسەلەی ( حرف صـــحیح و حرف علە ) بیـانـو پێ گرتنێکی بێکەڵکەو ـ د• نەسرین بەنیوەناچڵو دوور لە مەبەســـــتی مامۆستا نووری عەلی ، هێناویەتە کایەوە ، ئەمـــەش لە پێناوی بڕیارێکی نابەراوردانەدایە •

مامۆستا نووری عەلی ، بڕگە ئاسایانە چەند پاشــگرێکی رواڵەتانەی لــە نامیلکەکەیدا ( گرتنی کەلێنێکی تر ••• ) تـۆمـارکـردوە ، کە دەڵێ :

ـ ەوە ، رەوە ، تەوە ••• هتد • لەوێدا دێتە سەر فۆرمی « وە »ی دوای پریپۆزیشن ، لەگەڵ دەنگداردا ( مەبەستی بزوێنە ) وەك :

« پێ + وە ، لێ + وە •• » •

ئەم بیچمە جیادەکاتەوە کە بە دوای ( حرف صـحیح ) دابێ ، وەك :

« تێك + ەوە ، لەبن + ەوە ••• » •

هەرگیز مامۆستا نووری مەبەستی ـ ەوە ـ ی پاشـگر نیە ، چونکە بەدوایدا نووسیویەتی : « ەوە » ی تەکرار •

ئەم بڕیارەی لە بەڵگەی چوارەمیدا خۆی ساغ دەکاتەوە ، کە دەڵێ :

« ب ئەگەر بلکێت بەو وشانەوە کە کۆتاییـــان بە بزوێنە ، ( حرف ربط ) ی نـاوێ وە بـە « وە » دەردەکـــەوێت ، نـەك بـە « ەوە » وەك « پێ + وە ، لێ + وە » وە لـە کرمانجیی ســــەروودا « ڤە = وە ـ ڤەگەڕان » •

✱ دوای نەختێك تێرامان ، پێویستە بەرەورووی پەراوێزەکەی لەمەڕخۆی ببێتەوە ( بۆ ل ٢٤٣ ی گوتارەکەی‌و پەراوێزی ژمارە ـ٢٤ـی هەندێ لەمەوبەرمان ) •

لەوێدا وای پێڕاگەیانـدین کـە هـەنـدێ لێکۆڵـەرەوەی زمان ، سوفیـکسی « وە » و ئامرازی « وە » یان بۆ جیاناکرێتەوە !!

لێرەدا بێجگە لە دوکتۆر خۆی کەسیدی دەست‌نیشان ناکەین ، کـە لە لێکوڵینەوەیەکی زانستیی « ٤٠ ، ٥٠ » لاپەڕییدا ، ســـــوفیکس‌و پاشکۆ پرپیۆزیشنی ، کردبنەوە بەیەك ، چونکە لە تاقانە نموونەکانیـدا : ( پێوە ، لێوە ) پاشـکۆی حرف جری کردە دایکەو ماکزای = بە [ ەوە ]ی سوفیـکسی دووبارەو گەڕانەوەی کار ••• !!

ئیدی ئەم قیاس مساواتەی داوە بەدەستەوە :

« ەوە = ڤە = وە ⟵ ەوە = وە = حرف جر »[٢٦] •

---

(٢٦) خوێنەر هەستدەکا ، کە نوسینی ئەوچەند لاپەڕەیە زیاد لە پێویست، عەرەبی‌و لاتینی ئامێز بوون . دەڵێم : ئەوان بەو شێوەیە نووسیویانەو دەسەڵاتی منی تێدانیە .

**ئـەم پرســـیارانە :**

١ ـ بەدرێژایی ئـەو لێکۆڵینەوەیەی ، تاقە کارێکی کۆتایی هـاتـوو بـە بزوێنی نەخستە روو •• ؟ کە بەدەیانیان لەبەرچاون ؟!

٢ ـ ئایا ئەم مۆرفێمە هەر بە چاوگ‌و کارەوە دەلکێ‌و بەس ؟

٣ ـ ئایا ـ لەسەرتاپای کرمانجیی سەروودا هەر پێشگرەو ـ ڤە ـ یە ••• لە کرمانجیی خوارووشدا هەر پاشگرەو ـ وە ـ یە ••• ؟! •
ئەمانەو چەندان پرسیاری‌دی •

**ئەنجامی بۆچوونەکەی :**

١ ـ ورووژاندنی چەنـد گوتارێك لـە گۆڤارەکانی کۆڕداو لـە چـەنـد کتێبێکی‌دیدا • هەمووی دەبێتە خەرمانێك بۆ لێکۆڵینـەوەو بـاری سەرنج •

٢ ـ سەرهەڵدانی زۆر لاباس‌و لادان لە هەندێ هاوکێشەی وشەسازی •

٣ ـ بەیەکداچوونی پاش‌گرو ئامراز ، دواتر جیانەکردنەوەیان •

٤ ـ بەراوردنەکردنی لەگەڵ هاوفۆرمەکانی دیکەیدا •

٥ ـ لێك‌دانەوەی ئەرك بە ( معنی ) •

٦ ـ جیـــانەکردنـــەوەی ئینتەرفیکس‌و بەندی فۆنێمی لـــە ئامـرازی پەیوەندی •

٧ ـ خستنەکاری فۆنەتیك لە بڕگەکاریی بێ‌سەبارەتدا •

٨ ـ نیازێکی نەگونجاو لەگەڵ باری مێژوویی زمانە ئەدەبیەکەماندا ، کە دەڵێ :ـ

« بۆیە ( ڤە = وە ) م هامبـــەرکردون لە پێناوی ، نزیك‌بوونەوەی هەردووك شێوە زمانەکەدا » •

سەربەخاڵی هەشتەم هەر ئەوەندە دەڵێم :

زمانی نووسینی نەتەوەیەك ـ بەو زەمینە فراوانەیەوە ، لەسەر ئەوە پەکی نەکەوتوە ، کە سەر بەسەریّ بە دەنگی ( و ) و ( ڤ ) بکەین ، گرنگ دۆزینەوەی باری مێژوویی و قالبی رەسەنە . جا ، سەربە هەر ، شێوەیەك بیّ[٢٧] .

لە سەرتاپای کوردستاندا . بە تایبەتی لە مەیدانی زاراوەدا کە لە زمینەی زمانە ئەدەبیە کەدا شوێنیان چۆڵ بیّ ، یان هەردەفێکی زمانی بەمەرجیّ نەبێتە مایەی گەردان و رستەسازی‌ی هەمەچیزە[٢٨] .

— ٢ —

* پوختە بۆ چوونێکی ـ مامۆستا خاڵ ـ :

( بۆ گۆڤاری کۆر ـ ژ ـ ٢ ـ ب ـ ١ ـ ل ٢٥٦ )

١ ـ پاشگرەکە « ەوە » و « وە » نیە . مەگەر لە ناوچەیەکی زۆر

---

(٢٧) دیسان لە گوتارەکەیداو لەپێناوی ئەو نزیك‌کردنەوەیەدا ، لەباتی کاری « دەبێت ، نابێت » قالبی « دەبهێت ، نابهێت »ی بەکارهێناوە ، لاری لەوەدانیەکە بەو زێدە دەنگەوە لە هەندیّ دەستەشێوەدا ، ئەو قالبە دەگوتریّ . لەسەرتاپای زمانی کوردیدا ، چاوگی ئەو کارە « بوون »ە ، قەدەکەی ( بوو ) کاری رابوردوە ، رەگەکەشی + راناو ( ب + .. ) یە ، ئیدی بەنیشانەو راناوەوە ، رەگی ( ب ) گەردان‌دەکا ، وەك لە رانەبوردوو ، داخوازیدا . بە ئیستیقرا کورد « ە » قالبە چاوگی ریشەیی هەیە .

بێتو بەحەلێبی ئەو « دەبهێی » بنجی بیّ ، دەبیّ بلێین « ٦ » قالبە چاوگمان هەیەو ، چاوگی ( هائی : بووهن ) یشمان هەیە . بۆ گەردانی چاوگی « بوون » کورتە بەحسێکم نووسیوە .

(٢٨) لەهەمان دەربازگەوە ، بەرهەمێکم بە چاپ‌گەیاند :
« گوڵ‌گەشتێك بەمێرغوزاری خانای قوبادیدا »
رەئووفی ئەحمەد ئالانی ، سلێمانی / ١٩٧٩ .

بچکۆلانەدا « وە » بەکاربهێنن • جا بزوێنی لەپێشەوە هەبێ یانەبێ هەر تێکڕای « ەوە » یە[29] •

٢ ـ لەمسێ ئەرکانە دەرناچێ :ـ

أ ـ دووبارەکردنەوەی کارێك :ـ نوستنەوە •

ب ـ گەڕانەوە بۆ دوا :ـ هاتنەوە ، چوونەوە •

جـ ـ بەرەبەرەو هێواش‌هێواش تدریج ، وەك : بردنەوە ، کردنەوە •

---

ئەم گوتارە بەهۆی رەخنەکەی دوکتۆر نەسرینەوە سەری هەڵدا ، لەگەڵیدا ، پێشەکیی فەرهەنگەکەی خستەوە بەرچاو •

وەك باسێکی سەربەخۆ تاوتووی پێنەکردوەو لێی نەکۆڵیوەتەوە •

کە تێکڕای « ەوە »ی بەبێ گۆڕان ، داوەتە پاڵ ئەو شــــــــارە کوردستانیانەی ناوی هێناون ، حوکمێکی گشتی نابەراوردانەیـە ، هەروا بە ئاسانی لێیوەرناگیرێ ، چونکە هەر لەو هەرێمانەدا ، چەندان گۆڕانی بەسەرداهاتوە ، هۆی گۆڕانیش لە ناوچەیەکـــــەوە بۆ ناوچـەیـەکیدی پێویستی بە بەڵگەکاری هەیە •

چونکە مەسەلەی ئەو مۆرفێمە گەلێك لەوە فراوانترە ، کە تەنهـا بە دوای چاوگ‌و کارەوەبێ ، یان تەنها لـە جغزی پاشگرایەتی‌و بە « ەوە » یان بە « وە » بۆ هەموو کرمانجیی خواروو هەرێمی دهۆکیش یـان بـە روخساری « ڤە » لە هەموو کرمانجیی ســـەروودا • گریمان وەهاش‌بێ

---

(٢٩) بەپێی ئەو سنوور کێشانەی ( ل ٢٦١ ) کە دەڵێ :ـ

« هەموو ناوچەی سلێمانیو ... خانەقین‌و دهۆك‌و بەشی زۆری ناوچەی هەولێرە ، وە هەموو کوردوستانی ئێرانە ، بە هەموو بـانەو سـەقزو سابلاغ‌و کرماشـــانو ســـەردەشتەوە ...... بـەدوای بزوێنیشەوە هەر « ەوە » ـ دەردەکەوێ » .

بەبێ بەڵگەو سۆراخ لێی دڵنیانابین • یان کە دەڵێ : « مەگەر لە ناوچەیەکی بچکۆلانەدا بە ( وە ) بەکاری بهێنن » •

دەبێ بپرسین : کام ناوچەو لەبەرچی ؟!

ئەوەندە هەیە رایەکی ئەوتۆی نەورووژاندوە کە گیروگرفتێکی زۆربنێتەوە •

لەبارەی ئەرکیشەوە : ئەو واتا زەبەندانەی دە نەسرینی کرژکردوەتەوە لە سێئەرکدا •

**ئەنجامەکەی :**

١ ـ مامۆستا خاڵ راستەوخۆ بەحسی بۆ تەرخان نەکردوەو بەراوردی تێدا نەکردوە •

٢ ـ لەگەڵ هاوفۆرمەکانیدا ، شیی نەکردوەتەوە •

٣ ـ لەبارەی ئەرکەوە ـ بەرای من ـ تا رادەیەك وریاتر هەنگاوی بۆناوە •

٤ ـ هێنانەوەی هەرێمەکان بۆ تێکرای « ەوە » ، رووپێوێکی گشتیی بێبەڵگەیە •

---

ئەگەر تروسکاییەکیش بەدیکرابێ ، هێشتا بو بەندەنی مەبەست ، پێچوپەنای تەمومژاویمان لەرێدایە •



— ٣ —

✽ دوای جووتە گوتاری پێشوو ، گوتاری سێیەمو سەر بە مۆرفێمی « ەوە » دادەبەزێ ، مامۆستا ـ عەمید ئەحمەد حەسەن ـ رەخنەگرانە بەشوێنیان دەکەوێ : بەسەرباسی ـ پێشگرو پاشگر ـ لە

گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورددا ، بلاوکراوەتەوە ( بۆ ژ -٣- ب ، ١ • ل ٣١٩ ) •

ئەم پرسیارەمان بەرەو روویدەبێ : ئایا دوو گوتارەکەی لەمەڕ ئەوان - بەتەسەلی - بەراوردەکا ؟ •• لایەنی فەرامۆشکراو دەدۆزێتەوە ؟ یان شتێکی تازەیان دەخاتە پاڵ ؟

بەهەرحاڵ وا چاوەروان دەکرێ کە ئەم لێکۆڵینەوەیە ، خەستتر ببێتەوە •

وەك لەوەوبەر گوتم زۆر شت سەبارەت بەو پاشگرەوە دێتە کایەوەو دەبێتە مایەی ئاڵۆزە زمانی • ( ملابـة لغوية )

پوختە
**زادەی گوتارەکەی :**

١ - تا رادەیەك پەرچدانەوەی ئەو رایانەیە کە زمانەوانەکان تێیاندا لێکدی نزیکن •

٢ - لەو بەشوێنکەوتنەیدا باوەڕی بە ئەوەنیە کە پاشگری [ ەوە ] مۆرفیمێکی سەربەخۆبێ ، بۆیە بە کۆمەڵە پیتی [ ەوە ]ی ناودەبا •

دواتر دەڵێ :- « لە ڕووداودا ، ئەو دوو نووسەرد ، ئەو پاشگرەیان روون نەکردۆتەوە لەبارێکدا کە واتای وتە دەگۆڕێ » •

کەواتە لە چ خاڵێکەوە دێتەدەست ؟ • بڕوای وایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە پیتە ، واتە « ەوە » مەعنای وشەکەی گۆڕی ، ئەوا پاشگرنیەو بەشێکی بنجیی وشەکەیە ، کە دەڵێ :

« ئەو دوو کۆمەڵە دەنگە ، - ەوە - ی بنجی وشەو - ەوە - ی پاشگر ، تەنها لە رواڵەتا ، لێك چوونیان هەیە ، وەك : - کوولەکە - و - کۆڵەکە - » •

دیسان چەند نموونەیەك دەخاتە بەر چاو کە کۆمەڵە دەنگی « ەوە » لە جەزری کارەکەبن وەك :

أ ـ « کردن ، کردنەوە ـ بوون ، بوونەوە .... » .

ب ـ « هەڵگەڕان ، هەڵگەڕانەوە ، دەنگدانەوە .. » .

**تۆژینــەوە :**

١ ـ کۆمەڵە دەنگی « ەوە » خۆی بەخۆی ، لە روخســارو گۆکردندا ، وێچوونو موشابەهەی بۆ نابێژرێ . مەسەلەکە هیچ پەیوەندی بـە « کوولەکە ـ و کۆڵەکە » وە ، نیە ، ئەمانە نێوانیان سەماو زەمینە ! خۆزگە هەموو بێژەیەکی زمان بە ئەندازەی « کوولەکە ـ کۆڵەکە = Kûleke - Koleke » لێکدی دوور بوانایە !!

٢ ـ شێوانە رواڵەتیەکــە یەخەی خۆی دەگرێتەوە ، هەموو زمانەوانێك بێژەی ( بۆ ) کە پریپوزیشنە ، وەك لە ( دەچم بۆ بازاڕ ) دا ، لەگەڵ بڕگە ( بۆ ) ی ( سێوەکە بەربۆوە ) جیادەکاتەوە .

ئنجا کاری ( بوو ) و ( بۆ / وە ) هەر یەك ماکن .

کەواتە بۆ ئەم شیکردنەوەیە :ـ

— بوو : کاری رابوردووی رەبەق .

— بووە : کاری رابوردووی نزیك .

— بووبوو : رابوردووی دوور .

— بوو + ەوە : بۆ دووبارەو بەردەوامی .

ئەمانە بەگەردانو لکێنی تایبەتی لە چاوگی « بوون » دابەزیون .

هەمان کار گۆڕانێکی فۆنەتیکی بەســەردا زاڵبووە ، بە تایبەتی لـە زمانی قسەداو لە زمانی نووسینیشدا ، بە دەربڕینی ( بۆوە ) لـە جیــاتی ( بوەوە ) لەکاردایە .

بلێین‌و نەڵێین تازە سەری پێوە ناوە ، خۆشم لە قســـەدا هەرئاوای دەبێژم ، لە نووسینیشدا ، جارجارە لێم دەترازێ •

ئەگەر ڕێزمان بۆ دابین‌کردنی دەقی نووسینێکی یەك‌گرتووی کوردان تاوبدەین ، تێ‌چڕانی ئەم جۆرە ســوانــەوەیە ، زۆر بە زەحمەت دەکەوێ لەمەیدانی مۆرفۆلۆژیدا •

گۆڕانی قاڵبەکاری ( بووەوە ) ڕاستتر ( بوەوە ) بە قالبی ( بۆوە ) هەروەها ساکارانە نیە ، پەیوەندی بەخاڵێکی تەلیسماوی‌ی دەنگسازیەوە هەیە •• بەستتراوە بە باری لچولێوو تەقینەوەی چەند دەنگ‌و بڕگەیەك لە بارێکی تانی یان تەنافی بۆ خاوکردنەوەیەکی تایبــەتی ؛ کارەکــە ئەوەنــدە ئاسان نیە کە بڵێم : لە فلاّن شوێن ئاوای دەڵێن‌و لە فلاّن ناوچەش وەهای دەڵێن •••• ؟ • بۆ شوێنی خۆی •

زمانیش ( لە تۆژینەوەدا ) ئەوەندە دەستەمۆنیە کــە بەو بۆچوونەی مامۆستا عەمید ئەحمەد ، دابین‌بێ ؛ کە دەڵێ : « بوو » وشـــەیەکـــەو « بۆوە »ش وشەیەکی سەربەخۆیەو لێکدی جیاوازن » •

بێتو لە هەندەرانەوە ، بقۆزرێنەوە ، کارێکی ســـەخت بەرپادەبێ ، زمانەوانێکی دەرەکی چەندە شارەزایی هەبێ لە زانســـــتە بێ‌لایەنەکـانی زماندا ، وەك ئێمەی زمانخۆ پەی بە نهێنیەکانی نابا • لەوانەشە ئەم جۆرە بۆچوونانە بکاتە ملك بەســــــەرمانەوەو بڵێ : « بۆ ـ جۆرە کـارێکەو ـ بۆوە ـ ش جۆرە کارێکی دیکەیەو ـ وە ـ بەشی کارەکەیــە •• یان بڵێ : ـ بۆ ـ ی ئامرازی پەیوەندی بەهۆی کۆمەڵەی ـ ەوە ـ دەبێتە کار لــــە زمانی کوردیدا • !! » •

نووسەر دەڵێ :ـ کۆمەڵە پیتی « ەوە » ئەگەر واتای گۆڕی بەشێکە لە بنجی وشەکە ئەگەر نەشی گۆڕی ئەوا پاشگرە •

لێرەدا دەپرسین :

١ – بەشی بنجیی وشـــە بەبێ گەردان چۆن کاردەکاتە سەرخۆی ؟ ..
یان کە وشە لە رووی فۆرمەوە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەیە چۆن
واتاکەی ، لە دۆخێکەوە دەگۆڕێ بۆ دۆخێکی‌دی ؟

٢ – پاشگرێك‌بێ‌و لە دەرەوە کێش کرابێ‌و کاریش نەکاتە سەر مەفهومی
وشەکەو نوێی نەکاتەوە بۆ مەبەستێکی‌دی ، دەبێ چ نرخێکی هەبێ
لە پاشگرایەتیدا ؟ (منطقی) تر (معقول) تر

هێشتا ئەم بۆچوونەی پێچەوانە بوویایە ژیربێژیانەتر دەبوو .

لەم قسانەوە ئەوەندێکی تاوتووی پێ‌بکەین ناگەینە ئەنجام .

نووسەر جیاوازی لە نێوان پاشـــگری « ەوە » و پاشـــکۆ ئامرازی پەیوەندی ( حرف جر ) دا ناکاو تێکەڵیان دەکاتەوە ، کە دەڵێ :

١ – بۆ واتاگۆڕین ، وەك – بن ، بنەوە .

٢ – بۆ دەرخستنی شوێن ، وەك :

— لە رەواندزەوە ... لەماڵەوە ... هتد .

لە یەکەمیاندا ، واتاگۆڕین لە کایەدانیە . لە دووەمیاندا ، واتای شوێن لە خودی ئاوەڵ کارەکاندا ، رەنگ دەداتـــەوە ، ئـــەرکی ئامرازەکە ، بـــە ئەڵقەی بەراییی‌و دوایینەیەوە بۆ جۆش‌دانی رستەسازیەو ســـــــــەر بـــە وشەسازی نیە(٣٠) .

---

(٣٠) لە پاڵ ئەو مۆرفێمەدا نووسەر ، دیاردەیەکی دیکەی زمـــانی کوردی دەشێوێنێ ، کە دەڵێ :

« وشەی – مامۆستا ، شەوگەرد ، گوێسوانە ... هتد ، ئەمانە لە ئینگلیزیدا سادەن ، دەبێ لە کوردیشـدا بە سادە دابنرێن » . بەلای منەوە ، رایەکەو زمانی کوردی بێ‌نازدەکا .

**ئەنجامی ڕای نووسەر :**

١ ـ شتێك لە كایەدانیە كە پێی‌بگوترێ پاشگری [ ەوە ] •

٢ ـ نەگونجاوانە دیاردەی ( لێك‌دراو )ی بەستەوە ، بە هەندێ زمانی هەندەرانەوە •

٣ ـ گەردانێكی وشەسازیانەی لێ‌نەخستەكار •

٤ ـ بەرەی ڕستەسازی‌و بەرەی وشەسازی لێكدی جیانەكردنەوە •



— ٤ —

وەك زنجیرەیەكی نەپساوە ، دوا بەدوای ئەو سێ گوتارانەی كە خرانە بەرتیشكی لێ‌كۆڵینەوە ، بۆچوونێكی تازە بابەت ئاوقەدیان دەبێتەوە[٣١] •

دوكتۆر ( پاكیزە ڕەفیق حیلمی ) لە نێوان باسەكەیدا ( بووژانەوەی زمان ) لەم پاشگرە دواوە ، ئەویش هەر لەسەر ڕای دوكتۆر نەسرین ئەوەندە هەیە ئەو بزوێنە بەراییەكەی بە « حرف ربط » دایە قەڵەم‌و ئەم بە بەندێكی فۆنێمی دادەنێ ، ئەمەش پوختەی بۆچوونەكەیەتی :ـ

« پێویست زمانی وا ڕاهێناوە ، كە فرمان‌و چاوگ ، بۆ بەخشینی مانای تایبەتی ، وەك پاشبەند ، مۆرفێمێكی تایبەتی پێوەبلكێت ، ئەم مۆرفێمەش / وە / یە » •

---

(٣١) گۆڤاری كۆڕی زانیاریی كورد ، ژ ـ٣ـ ب ـ١ـ ل ١٤٣ . سالی ١٩٧٥ .

وەك دەردەكەوێ ، بەتاوی نیمچە بڕگایەتی‌و فۆنەتیك سازی ، لایەنێكی گەردانی كوردی لە گرێژنە دەچێ .

دیسان پەراوێزێکی دەداتێ :

« بزوێنی پێشەوەی ـ + ە + ئەمە بەندێکی فۆنیمی ـ دەنگیە ، بۆ جووتبوونی دوو کەرتە پێویستە ، دەورێکی مۆرفێمی سەرفی یا نەحوی نیە لە وشەدا » .

بەبێ هیچ لێکۆڵینەوەیەك ئەو بڕیارەی داوە ، دواتر دەهێنێ چاوگە ریشەییەکان بەبێ هیچسەبارەتێکی دەنگسازی یان وشەگەردانی بڕگەبڕگە دەکا . وەك خۆی ئەمەش چەند نموونەیەکی :ـ

١ ـ بۆ قاڵبی ( ا ) : سووتا + وە ... سووتا + ن + وە .

٢ ـ بۆ قاڵبی ( ی ) :

سڕی + یە + وە ،

سڕی + نە + وە ... هتد[٣٢] .

شیکردنەوە :

لە زوربەی نووسینەکانی دوکتۆر پاکیزە بە ئاگام .. بە تایبەتی لەبارەی مێژووی زمانەوە ، یەکەم جاریشە کە بەسەر ئەم نووسینەیدا بکەوم ، لە مۆرفۆلۆژیدا .

کەواتە پێشەکییەکو سەرژمێریی ئەو بەندە فۆنیمو بڕگەکاریەی کە بەلای منەوە لە رکێفی وشەسازیدانین :ـ

---

(٣٢) دوکتۆر لە جەرگەی ئەو گوتارەیدا چەند قسەیەکی بەرەو رووی نەشارەزایانی زمان کردوەتەوە ، پێویست ناکا بەندی یەکەمیان بخەمە بەرچاو ...........

لە بەندی دوەمیاندا هێمن‌ترەو دەڵێ : « زمانشناسی زانا کە باسی وشە سازی دەکات دەگەڕێت بە شوێن ئەو رایەڵو کێشو تەرازوانەداو شیرازەی نابچڕێنێت راوەبەند ـ Affix ـ **بکاو لەم** یەکو لەو دوان بێ سەروگوێ بگرێ » ـ بۆ ( ل ١٧١ )ی گوتارەکەی .

١ ـ یـه : تێکرا نه ئێنفۆنیکەو نه ئافیکسـه ، پێکهاتوه لـه دوو بەش : ( یـ ) ی کۆنسۆنانت و ( ه ) ی بەشـه مۆرفێمی [ ەوه ] بەبێ هیچ پێویستییەکی رێزمانی ، سازیداوه •

٢ ـ ن ـ : نیشانەی چاوگەکەیەو پەیوەندیی بە دەنگسازیەوه نیه ، واته پێویستی کرکەو دەنگی رووت نەیهێناوه •

٣ ـ بەبێ سەبارەت له دوو بەش پێکهاتوه : ـ ن ـ ی چاوگو بـەرایی مۆرفێمەکه •

٤ ـ وه ـ ی یەکەم له ( چوو + وه + وه ) دا : کورد دەڵێ : ( چوەوه ، یان چۆوه ، یان چووەوه ) • له هەموو روویەکی دنگسـازیو وشـەسازیەوه ، قالبی « چووەوه » ناگونجێو شیکردنەوەیەکی هەڵەیه •

دوای خستنه بەرچاوی ئەو دابڕکردنە بەرەو قووڵکردنەوەیەك :

١ ـ نووسیویه : « سووتا + وه » •

به هەستێی ئەو ، میساله بۆ پاشگری « وه » ی دووبارەو بەردەوامی• بەڵام ئەو کاره ، رابوردووی نزیکه ، وەك ( خستوه = خستگه ) •• ئەوەتا کورد دەڵێ : ( خستوه ، گرتوه ) لـه رووی گۆکردنـەوه ، لچولێو سەغڵەت نابێو بەندە۔ دەنگیشی بۆ سواربوونی دووکەرته نەهێناوەتەوه •

بەکورتی : که بڕیاریاندا ، پاشگرەکه بریتیه له [ وه ] ئیدی فەرزی بەندەدەنگی ناوێ ، کەواتـه بۆ ئـەم گۆکردنـانـه به رەوانی : ( سروه ، لبنقه = لەبنەوه •• هتد ) •

٢ ـ « سڕی + نـه + وه » :

ئەگەر بزوێنی « ە » نێوبەست[٣٣] بێ « ن » چاوگی بۆ رەگەڵ خستوە ؟!

ئەگەر بۆ مەبەستەکەی خۆشی بێ ، بەم شێوەی دابڕیایە : ( سڕین + ە + وە ) •

بەداهەت دەی سەلمێنێ :

کە ئەو لەلەکردنە سەربە هیچ زانستێک نیە ، تەنانەت هەندێکیان سەربە هیجای شیعریش نین ، وەك : ( سووتا + یە + وە ) ، بە ژمێرە پەنجەی بڕگە ، ئاوا دەبێ :

( سوو + تا + یە + وە ) دەبێتە چوار بڕگەی تەواو •

٣ ـ نووسیویە : ( سووتا + ن + وە ) :

١ ـ ئەگەر هەڵەی چاپبوونایە دووبارەو سێبارە نەدەبوونەوە •

٢ ـ ئەگەر چاوگ بێ بە حیسابی ئەویش بەم چەشنە دەبێ :

أ ـ سووتان + ە + وە •

ب ـ بە بڕگایەتیش بێ : ( سوو / تا / نە / وە ) •

جـ ـ ئەگەر چاوگی تێپەڕیش بێ :

( سووتاند + نە + وە ) بە حەلێبی ئەو •

د ـ ئەگەر لەسەر ئاهەنگی سەر بە ناوچەشابێ کە / د / تێدەبەن ، لە شیکردنەوەدا قبووڵنیە ، ئەگەر قبووڵیش

---

(٣٣) بۆ کونسۆنانت لە نێوان دوو بزوێندا زاراوەی ( نێوبڕ )م ، پێشنیازکرد ، بۆ بزوێن نە نێوان دوو کەرتەدا ـ وەك ئینتەرفیکس ـ و ئافیکس ، زاراوەی ( نێوبەست ) یش ، پێشنیازدەکەم و لە خێڵی پێشگرو پاشگر نین •

جا بۆ (نێوگر = ناوگر) نەبێ ؟ ئالانی

بێ لەســــەر کێشی رابوردووی نزیکەو مۆرفێمەکەش [ وە ] ی دووبارە نیە •

هـ ـ ئەگەر ئەوانەش بسەلمێنرێن ئایا بەندی ( + ن + ) چی‌یەو بۆ چیە ؟ بە حیســابی بڕگەو تێوبەســت پێویستیمان پێی نیـە کـە بڵێین : ( سووتا + وە ) •

ـــ گریمان ئەویش تێوبـەســـتە ، نابێ دەوری مۆرفۆلۆژی ببێنێ • ئەوسا چاوگە ریشەییەکان بەبێ نیشانەی چاوگ دەمێننەوە ؟!

ـــ ئەگەر ( سووتا + ن + وە ) سووكکراوەی ( سووتاندوە ) بێ ، دەق کاری رابوردووی رەبەق دەردەچێ‌و ، پتر بەهەڵەدا دەکەوین •

---

## ئەنجـام

١ ـ نووسەر ئەوەی دا بە دەستەوە کە جیاوازی نەبێ لە تێوان پاشگری دووبارەو نیشانەی کاری رابوردووی نزیکدا •

٢ ـ شی‌کردنەوەی قالبە چاوگیەکان لەگەڵ ئەو مۆرفێمەدا سـەر بە هیچ زانستێکنیە ، تەنانەت سەر بە ژمێرە پەنجەی شیعریش نین •

٣ ـ شـــتێك لەســـەر بناغەی راستی‌بێ ، ئـەو هـەموو ئیحتمالانـە ناگرێتەخۆی •

٤ ـ بۆیەش پترپێزم بە شی‌کردنەوەکاندا نەبەشـــکم ئـەو بڕگەکاریـە بقۆزرێتەوەو ببێتە تەگەرەیەك لە وشەسازیدا •



مامۆستا مەســـعوود محەمەد ـ کە لە وردەکاری ڕێزمـانـدا بیرتیژە نیگای داوەتە ئەو مۆرفیمەو لەوکێشەیەی لەمەوبەرمان ئاگادارە ، دواتـر لێی کۆڵیوەتەوەو تروسکەیەکی لێوەدەرخستوە ، لە پەراوێزێکیداو لــە میانی ڕەخنەیەك ـ دا بەم شێوە بۆی چووە[٣٤] ، بەکورتی :

« ١ ـ لـە شـێوەی سلێمانیدا ، بزوێنە ســـــەرەتاکەی دەپـارێزن ، وەك ( گەڕایەوە ••• ) دەنگی / یـ / بۆ پاراستنی بزوێنەکەیە •

٢ ـ ڕاست نیە کە بزوێنی « ە » بۆ جووتبوونی دوو بڕگە بێ ، چونکە لەو شوێنانەدا کە دەڵێن ( برژاوە •• ) پەکی پاشگر نەکەوت لەسەر هێنانی پیتی پەیوەند ، هەندێجار تێدەبڕێ‌و هەندێجار تێنابڕێ ، بە قیاس لەسەر بزوێنی ـ ەکە ـ ی تەعریف ، وەك ( گاکە ، گایەکە ) تێچوون‌و تێنەچوون نابنە بەڵگەی بنجی‌ونابنجی ، کارەکە ئەوەندە ئاسان‌نیە کە بەبێ لێکۆڵینەوە ، بەســەریدا تێپەڕین ، بەتەنها خـۆم بڕیارێك نادەم •• » •

**لێ وردبوونەوەیەك :**

لە لووتکەی نووسینەکەیەوە تا بەندەنەکەی ساماڵ‌و دواتر تەمومژ لە گەردبینێکدا خۆی دەنوێنێ •

ئەوەی پیشان‌داوە کە بزوێنەکەی تێوبەست‌نیە ، ئەمە ســـامالێکەو بێ‌گەرد ، کە نموونەشی هێناوەتەوە بە « برژاوە » بێ‌تێراماں نیە ؟!

أ ـ یەكسەر ناڵێم وەك پاشگرو بە هەمان فۆرم خۆی‌نادا بە دەستەوە ••• بەڵام لە چ هەرێمێکداو بە چ ئاوازو دەربڕینێك‌و لەبەرچی ؟

(٣٤) گۆڤاری کۆڕی زانیاری ، بەرگ ٣ ، بەشی ١ ـ ل ٢٦ ساڵی ١٩٧٥

ب ـ به هەمان قالب ( برژاوه ) دەقی کـــاری رابوردووی نزیك دەدا بـەدەستەوەو ، مۆرفێمەکە تەنها « وه » یە و ، نیشـــــانەیە • بواری لەســـەر رۆیشتنیش نادا ، کـە دەڵێ : « بەبێ لێکۆڵینـــەوە خـۆم بڕیارێك‌نادەم » !!

وادەخوازێ ئەم خاڵەی زەق‌بکەمەوە ، کە دەڵێ : « پیتی ـ یـ ـ لـە ( خولایەوە ) دا بۆ پاراستنی بزوێنەکەیە » •

**نیگایـەك :**

ئەو قســـەیە بێ‌گومانە • بەڵام بۆچی دەبێ بپارێزرێ ؟ •• خۆزۆر دەنگ‌و بزوێنی دیشمان هەن کە بنجین‌و ناشپارێزرێن ؟؟

با ئەمەیان بهێڵینەوە • ئەم ( یـ ) تێوبڕە دەکەمە ، مەتەرێزێك‌و لێیەوە دەڕوانمە بەندەنی نووسینێکی دیکەی •

★

— ٦ —

دوای تێپەڕبوونی تەمەنێك بەسەر ئەو پەراوێزەی مامۆســـــــتا مەسعوود دا ، هەمان کێشە سەر هەڵدەداتەوە :

لە « رێزمـــانی ئاخاوتنی کوردی » دا ، لاپەڕە ٢٣٨ ـ ٢٤٢ ، چاپی ١٩٧٦ •

راستەوخۆ ـ وەك رایەکی چەسپاو ـ بڕیاری لەسەردەدا ، بەسـفەتی لێکۆڵەرەوە ساغ‌کردنەوەکەی لەدەست دایەو لیژنەی کتێبەکە لێی‌دڵنیایە ، لەوێدا نووسیویەتی :



« چ مانیعێك نیە لەوەدا بگوترێ پێشگرەکە ، تێکرا « هوه » یـە ، تەنـانـەت کە پیتەبزوێن دێتە کۆتایی کار ، پیتێکی کۆنســـۆنانت ، دەی پارێزێ ، وەك [ هاتومەتەوە ] لێرەدا ( ت ) بزوێنەکەی پاراســـــت •

له گەلێ شێوە ئاخاوتنـــدا ، دەگوترێ ( گەڕایەوە ••• ) کە ( یـ ) وەك نونوقایە دەی پارێزی ، کە دەبێتە پێشـــگر ، امکانیەت نیـە بزوێنەکەی پێشەوە خۆی بەدەرخا ، ئەمەش بەدیهییەکەو کوتانەوەی لزوم نیە » •

**بەراوردێکی دوونووسینەکەی :**

١ ـ لەرای پێشوویدا ، دوو دڵ وەستا ، لە دوەمیاندا بەتێکڕای « ەوە » دڵنیابوو •

٢ ـ لە گوتاری یەکـەمیـدا ، تێوبڕی « یـ » و لە دوەمیـاندا ( ت ) ی خستەپاڵ •

٣ ـ نووسینی دوەمی ، لە شێوەی لێکۆڵینەوە دایەو بەرەو مەبەســـتی هەڵکەوتی مۆرفێمەکەیە •

چەند پرسیارێك :

١ ـ ئایا ئەو بڕیارانەی لە کێشی ئەو کەمە لێکۆڵینەوەی دان ؟

٢ ـ تێوبڕە دەنگدارەکان هەر ئەو دوانەن ؟

٣ ـ ئەوا بزوێنە بەرایی پارێزراو تێو بڕیشـــــمان بۆ هێنا ••• بەلاّم چ ضرورة لغویة
پێویستە زمانییەك ، سازیداون ؟

لەم مەتەرێزەوە دەکەومە سـووسـە لـە نووسینی سێیەمیـدا ، کـە دەلێ(٣٥) :

« هەندێ شت کە پشتیان لە دەستووری زمان کردوە ، لە شـێوەی سلێمانیدا ، چ بە سوانەوەو چ بە زیادیکردن ، دەبێ نووسەران خۆیـانی لێبدزنەوە » •

---

(٣٥) هەر لە گۆڤاری کوڕدا ( بۆ ـ ژ ـ ٥ ـ ل ٢٩٣ ـ ٢٩٧ ، سالّی ١٩٧٧ ) لە میانی گوتارێکیدا ـ چەند رووپەڕێکی رێزمانی کوردی ـ .
لە نێوان زێدەو سوانەی شێوە گەشە سەندوەکەی ســـلێمانیدا مەسەلەی ئەو نێوبڕەی کە لێی دڵنیابوو ؟ دەئاڵۆزکێ .

ئنجا لادراوەکان دەخاتە ڕوو ، وەك : « بلێرەوە » ئەمە لەجیاتی « بلێوە » کەس نازانێ ئەم دەنگەی ــ ر ــ یّ لاوازە لە کوێوە پەڕیوەتە نێوان فیعلەکەو پاشگرەکەی ــ ەوە / وە ــ ؟ • هەرچی فیعلێکی وەك ئەمیش هەیە ، لە شێوە ئاخاوتنی سلێمانیدا ــ ر ــ ێیەکی لاوازی تیّ دەترنجیّ » •

لەسەری دەڕواو دەنووسیّ :

« ئیتر بۆ دەبیّ لە کاتی بەکارهێنانی پاشگری « ەوە » و « وە » لەگەڵ فیعلی فەرماندا ــ ر ــ ێیەکی لاواز ، بێتەناوەوە ، لە کاتێکدا نە لە ڕێژە ــ صیفة ــ ی ئایندەو نە لە ڕێژەی ڕابوردوودا ، ئەم ــ ر ــ ێیە دەرناکەویّ ؟ ••• گوتمەوە ، کردمەوە ، دەکەمەوە ••• کۆتایی بەئەم ڕا تازەیەی دەهێنیّو دەنووسیّ : « کوردێکی دەرەوەی سلێمانی بە لاسایی‌کردنەوە نەبیّ »[٣٦] •

---

(٣٦) کوردی فێربوون‌و لێکدی گەیشتن ، بەچاو خۆیی‌و دەرەکیەوە جاریّ هەر بە لاسایی‌کردنەوەیە ، نە دەهێڵین زمانە ئەدەبیەکە خۆی بگریّ‌و ، نە پەیڕەوی ڕێزمانیشی تێداکراوە ، تا ئێستاش ڕێزمان هەر بۆ ڕێزمان تاودەدەین .

نموونەیەك بۆ دابین‌کردنی زمان بە ڕێزمان :

« منی کورد کە ئەم ڕستە عەرەبیە دەنووسم‌و دەخوێنمەوە : ــ عاد المسكين الى مسكنه ــ هەڵەشی تێدا ناکەم ، لەبەر ئەوەنیە کە پێی‌گۆش بووم ، بەڵکو لە ڕێزمانە سەر بە شێوە تایبەتیەکەیەوە . مەلەکەم پەیداکردوە کە : « عادَ » نەك « عادِ ، عادُ » ماضي مبني على الفتح « المسكينُ » بضمة الاخر لانه فاعل « مسكَن » على وزن « مفعَل » اسم مكان .... الخ .

جاریّ ئەو بەختەوەریەمان بۆ نەڕەخساوە !!

ئەگەر زەمینەی زمانە ئەدەبیەکەمان لە مەڵبەندەکەی ــ عکاظ ــ بەرین تریش‌بیّ ، نە نامە ئاسمانیەکەی بە پشتەوەیەو نە دەسەلاتی عوسمان .... ؟!

ئەو رێ لاوازەی بەدڵدانایێ ، پێویستە نووسەری سلێمانی خۆی دابێنێت بەوەی کـە بەســـەر زاری زوربەی ئاخێوەری کوردیەوەیە » • ئەمـەی تـائێرە •

**بەشوێن کەوتنێك :**

١ ـ مەسەلەی لادان لە دەستوور ، تەنها لە سنووری شاری ســلێمانیدا خۆی نەخواردوەتەوە •

ــ ئەگەر مەبەستی ئەوەیەکە سلێمانی بنکەی زمانی نووســینەو نابێ هەرچی خەڵکەکەی لە گفتی رۆژانەیاندا بەکاری دەهێنن بە فەسـیح بدرێتە قەڵەم ، بەلای منیشەوە رایەکی پەسندو بەجێیە ، ئەگەر کاملی‌ی‌و دروستی وشە بەوە دەست‌نیشان‌بکرێ ، کە بەســــەر زاری زۆرینەی ئاخێوەرانی کوردەوەیە ، بە رای من گوتەیەکی رەبـەقـەو پێویستی بـە ورد کردنەوەیەکی لەبارە ، بە نموونە لە کرمانجی‌ی سەرووودا ـ کە لایـەنی زۆریش نەبن ، لایەنی کەم‌نین ـ

دەنگی ( د ) ی مەند کە بە دوای دەنگی ویستـــــاوداین لە کۆتایی وشەدابێ یان بەرایی بڕگەی گیربێ لەناو دەچێ وەك (کێر=کێرد = کارد ، کرن = کردن ، صار = سار = سارد ••• ) :

« نـار = ئـاگر • حرّ = گەرمی • برد = صـــار
ثلج = بەرفـە • مـاء و سلسل = هـەردوو ئاف »
( نووبهارا ئەحمەدێ خانی ـ ١٩٧٩ )

کرکـەی دەنگی / س / بـە / ص / و تێچوونی دەنگێکی بنجی‌ی وشە ، لادانێکی ئاشکرایەو بۆ زمانی نووسین دەست‌نادا ، با ئەو لادانەش دیاردەیەکی زاڵبێ لە ئاخاوتنی رەمەکیدا • مامۆستا خۆی شارەزایە کـــە

دیاردەی لێلابردنو لارە ئاوازو گلماندنی دەنگی دوو لۆو زێدەدەنگ •• لە هەموو زمانێکدا بەرەهان •

لە زۆر گۆڕانی فۆنەتیکیدا ، رام لەگەڵ رای مامۆستایە ، وەك گوتم ئەمەش لە دەستووری زمانی ئەدەبیو نووسیندا ، پەیڕەودەکرێو لە پێناوی داینکردنێکی :ـ

گونجاوو ئاساندا ، دەنا ســـەرتاپای نەتەوەو کوردی زمان ، خۆی بۆخۆی کتێبە رێزمانێکی خۆکردەو پێویست بەم رەتانو کۆششە ناکـا • چۆنی دەڵێن بۆخۆیان وەستان •

بەر لە مامۆستا مەســـعوودو دواتریش ، دابەزیومـە ئەم مەیدانـەو رەخنەمگرتوە[٣٧] •

بەڵام لە بارەی ـ ر ـ لاوازەکەی لەمەڕ « بلێرەوە » ی سلێمانیەوە ، کە سەر بە زانست نەبێ ، بۆچوونێکی تایبەتیم هەیە :

---

(٣٧) أ ـ لە ساڵی ١٩٦٣ ـ دا رۆمانی « المشـــوە »ی ڤیکتۆر هیگۆم ، وەرگێڕایە سەر کوردی کە لە ـ ١٩٨٠ ـ دا چاپکرا ، ئەوســـا سلمکردەوە لە هەندێ وشـەی تەقلیدیو ســـواوە . بۆ یەکەمجار سـەرنجی رێزمانەکەی مامۆستا خاڵو مامۆستا نووری عەلیو مامۆستا کامل بصیر ـ م دا ، کە بۆ قوتابخانەی سەرەتایی دانرابوو ، بە تەمای هەندێ راستکردنەوە . کەچی چاوم هەڵەنگوت لـــە وشـــــەی « یانگزەهەم ، پانگزەهەم » ســــــەیرتر : « ئامرازی شـــوناسی ئاشکرانەکەر !! » ئیدی بۆ یەکەم جارو لە ســالی ١٩٦٧ ـ ١٩٦٨ ، بە « ١٥ » ئالقە رەخنەملێگرت ( بۆ رۆژنامـەی راپەڕین ، ئەیـلوولی ئەوساڵە ) .

ب ـ ســـەرژمێریەكو گێڕانەوەی « تێدا » و لادان لـە قاڵبی « تیا ، تیایا » . رۆشنبیری نوێ ژ ٧٥ ی ١٩٧٩ . رەئووفی ئەحمەد ئالانی .

وەك لە سەرەتاوە درکاندم ، جارێ بەبێ لێکۆڵینەوە بڕیار لەسەر خۆرم‌و ئەرکی ئەو پاشگرە نادەم ، بەڵام ئەو بڕیاریدا کە چ مانیعێك‌نیە ، تێکرای « ەوە » بێ •

کەواتە بە هەمان روخسار نالکێ بە کاری داخوازیەوە کە کۆتایی بە بزوێن بێ ، وەك :

« بڵێ + ەوە ، بخۆ + ەوە ••• »

جا ـ هەر وەك لە « خولا + یـ + ەوە » دا تێوبڕی ( یـ ) دەست‌نیشان‌کرد ، هەمان « ر » ی لاوازیش هەر تێوبڕە •

کە واتە لە بەختی خۆمانە پێویستی زمانەکە دروستی‌کردون‌و دەسەڵاتی نووسەرانی تێدانیە • (أحرار لغوية)

ئەگەر هەندێ لایەنمان لەلا ئاشکرابێ ، زۆر نهێنیە زمانیمان هەن ( سەر بە هەرێمێکی تەسك یان فراوان ) جارێ پەیان پێنەبراوە !!

٢ ـ قیاسی « بنووسەرەوە » لە « بنووسنەوە » ناکرێ ، تاوەکو بڵێین لەمیاندا ـ ر ـ نیە با لە ئەویشدا نەبێ ، چونکە لە قالبی کۆدا ، کارەداخوازیەکە ، کۆتایی بە ـ ن ـ ی راناو هاتووەو دەنگدارەو تێکرای « ەوە » ی پێوە دەلکێ ، بەڵام لە قالبە تاکەکەدا بێتو تێوبڕ نەبێ ، دەبێ یەکێك لە دوو بزوێنەکان تێبچن • ئەگەر یەکێك بپرسێ بۆچی کۆنسۆنانتەکە دەنگی ـ ر ـ یە ؟ ••

منیش دەپرسم : ئەی بۆچی لە « گەڕایەوە » دا دەنگی ( یـ ) یە ؟•• ئەم کارتێکرانە دەسەڵاتی خودی زمانەکەیەو بەبێ پێویستی سازی‌نەداون • یەکالای ئەو جۆرە نهێنیانەش ، ئەوەندە ئاسان‌نیە •

٣ ـ ئەگەر ـ ر ـ لاواز لە « بکەرەوە » دا زادەی نووسەران بێ ، دەبێ پاشگرەکە لە چ فۆرمێکدابێ ؟

بێ گومان دەبێتەوە بە « وە » نەك « ەوە » • کە بڕیاریشی لەسەر دودم بوو •

٤ - لاری لە وەدا نیە کە لە موکری و سۆرانیدا ، بە تاوی ئەوان بەکزی لە بابانیشدا لە هەندێ قاڵبی تایبەتیدا تێوبڕی بۆساز نادەن ، وەك : ( بایداوە = بایدایەوە ••• ) یان « بخۆوە = بخۆرەوە •••• » •

هەڵکەوتی ئەو دەستەشێوانە چۆنەو تا چ رادەیەك مایەی ئاڵۆزە زمانیە ، دەیهێڵمەوە بۆ بەشە لێکۆڵینەوەکەی خۆم •

« وتم بە بەختی خەواڵوو ئەتووبی خوا
لە خەو هەڵستە زەمانێ ( بچۆرەوە ) ئەولا »[٣٨]

لەو پێنج ئەڵقەیەی پێشوودا ، کەوتمە بەراوردو سۆراخ ، چونکە بەتاوی لێکۆڵینەوە ، یان رەخنەوانی دابەزی بوون ، سەرتاپایان تەوژمیان خستبوە سەر تاقە مۆرفێمێکی دەستەمۆو لە چەند روخسارێکداو لە ئاخاوتنی سلێمانیدا ، بەنیوەناچلیش لایەکیان لە پێشگری « ڤە » کردەوە • تەنها ئەمیان ، لێرەدا تا رادەیەك زەینی لێخستەکارو پەنجەی بۆ تێوبڕ ، برد ، بەلام بەبێ لێکۆڵینەوە ، بە تێوبڕی - ر - قایل نەبوو لە دۆخی داخوازیدا •



## — ٧ —

❋ مامۆستا نووری عەلی ئەمین ( بۆ نامیلکەی گرتنی کەلێنێکی تر لەڕێزمانی کوردیدا ) باسی مۆرفێمی دووبارەی کردوەو بەچەند قاڵبێك

(٣٨) حاجی قادری کۆیی •
بەپێی مێژووی ئەدەبی کوردی • عەلادین سجادی • ل ٦٩٢ •

پیشانی‌داوه ، لەوێداو بەبێ لێکۆڵینەوە دەنووسێ : « ٧٥ پاشـــــگری ـ ەوە ، ٧٦ پاشگری ـ وە ـ ، رەوە ، تەوە ، یەوە ... هتد » .

مامۆستا وەك هەنگاوناتێکی سەرەتایانەو بەتاوی بڕگایەتی ، سـەرو ژمارەی بۆ داناون .

بەو پێیە دەبێ مۆرفێمی دووبارە هەر لە قسەی سلێمانیدا ، چوارپێنج قاڵبی روخسار جیاوازی هەبێ ، ئەمەش راست نیە ، بەپێی شی‌کردنەوەیەکی زانستانە تا راددەیەکیش جۆری دەست‌نیشان‌کردوە کە دەڵێ : « ەوە ـ ی تەکرار ـ لە ... ەوە ـ ی حرف جرّ ، وە ـ ی ـ پێوە ، لێوە ـ کە بەدوای حرف علە وەبێ ، ـ ەوە ـ ی حرف جرّ ، کە بەدوای حرف صحیەوەبێ . وە ـ ی مازیی نەقلی ... هتد » .

مامۆســــــتا نووری لـە رواڵـەتی ئـەو مۆرفێمە دواوە ، ئـەوەی جیانەکردوەتەوە کە پریفیکس یان سوفیکس ، یان پریپۆزیشن‌بێ هەروەها کە نیشانەبێ . راست‌دەکا ، کە پاشکۆی پریپۆزیشـــــــــن‌بێو بە دوای بزوێنەوە بێ ، تەنها پاشکۆی ـ وە ـ دێتەکایەوەو بـزوێنی بەرایی نیـە . هەرگیز مەبەستی [ ەوە ] ی دووبارە نیە .

**تێبینی :**

وای بۆدەچم کە ( د. نەسرین ) بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەکەی ، ئـەم قسەیەی مامۆستا نووری بەناتەواوی راگوێزکردبێو تووشی ئەو هەڵەیـە بووبێ . دیســـــان گومان دەبرێ کە زانای کورد ، ( د. کوردۆێێف ) هەروەها مامۆستا ( جگەرخوێن ) کە دەڵێن پاشـــــگری « وە » بەدوای حرف ساکنەوەبێ ، هەر لەم نووسینەی مامۆستا نووری عـەلی ئەمینەوە ، سەری هەڵدابێ .

**ئەنجـــام :**

١ ـ نووسەر ، سێ توخمی هاوفۆرمی ، لە قاڵبی پاشگردا ، پیشانداوە •

٢ ـ حیسابی بۆ تێوبڕ نەکردوەو وەك بڕگە سەرو ژمارەی داونەتێ ، واتە ئەوەی‌کە ئێمە بە تێوبڕی دادەنێین ، ئـەو بەبەشێکی مۆرفێمەکـەی داوەتە قەڵەم •

٣ ـ ئەمەی لەسەردەمێکدا نووسیوەو شی‌کردنەوەیەکی وشەسازیانە نیە • ئەو کەرەسەیەی کە لەو سەردەمەدا رەتێوی هێناوە ، جێگەی رێزە ، حیسابی لێ‌کۆڵینەوەی ئێستای لەگەڵدانا‌کرێ •



## ـ ٨ ـ

* لە کتێبی ( سەرەتایەك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی ، ل١١٢ ، ١١٨ ـ ١٩٧٣ ) دا ، مامۆستا ـ محەمەد ئەمین هەورامانی ـ لە بارەی ئـەو مۆرفێمەوە نووسیویەتی :

« ڤە ـ زۆر جیاوازە لە ـ ەوە ـ چونکە ئەویان پێشبەندەو ئەمیـــان پاشبەندە » •

دیسان دەڵێ : « پاشبەندی ـ ەوانێ ـ لە زاری سلێمانیدا هەیـە بۆ دووبارەکردنەوە » •

**چەند نیگایەك :**

١ ـ نووسەر : بەبێ بەراوردو بەبێ بەرەنجامی دەڵێ : لـە راستیدا مۆرفێمەکە ـ ەوە ـ یە ، لە لاپەڕە ـ ١١٢ ـ دا ، بەڵێنی ســـاغ‌کردنەوەی دەدا ، کـەچی لە لاپەڕە ـ ١١٨ ـ دا ، بـەڵێنـەکـــەی لـــەم نیگایـەیـدا رادەگەیەنێ :

« پاشـــبەندی ـ ەوە ـ لە زۆر جێگادا بەکاردەهێنرێت ، وە بۆزۆر چەشنە / واتا ـ وەك :

« دەرگا لـە خەیاڵی تێوەشـــەوم ناکاتەوە »

ـ شێرکۆ بێکەس ـ

٢ ـ کـە لـە زۆر جێگادا بەکاردەهێنـرێ دەبێ لـە هەندێ جێگادا بەکارنەهێنرێو پێویستبوو دیاردییانبکا ••• ؟

٣ ـ تاقە مۆرفێمێکی کردەوە بە دوان ، کە لە رووخســـــاردا ، دەسەلمێندرێ •

دوەمیان کە ( ئەوانێ ) یەو بەحەلێبی ئەو ســـەر بە خۆیەو تەنها بۆ دووبارە کردنەوەیە • ئەگەر فۆرمەکەشی گۆڕابێ لەو تەنهـا ئـەرکەیـدا کورت هەڵنایەتەوە ! بەڵام بە چ شێکردنەوەو دەستوورێك ؟

من ناڵێم کە لە برێ ناوچەدا ، بەو بیچمە دەرنابڕدرێ • راستیەکەی ئەوەیە کە زێدەیەك نووساوە بە مۆرفێمەکەوە •

ئنجا زێدەکە تێکڕای ( ••• انێ ) یە ، یان ( ا = ە ) بـە گۆڕاتێکی دەنگسازی پاشان + ـ ێ = راناوی تەعدیە ، ئنجا ـ ن ـ تێوبڕ لە تێوان جووتـە بزوێنـدا ؟! ـ ئـەم لایەنانە پێویســـــتییان بە لێکۆڵینەوەیەکی سەختە •

٤ ـ وای پیشـــانداوە کە مۆرفێمی ( انێ ) تەنها بۆ دووبارەیەو پاشبەندە ، بەڵام ئەوەی فەرامۆشکردوە کە هەمـــان دیاردە لە رســـتە ســـازیشـــدا هەیە ، وەك بە دوای ئاوەڵکارو پریپۆزیشـــنو گرێی ئاوەڵکارەوە ، وەك ( لە ماڵەوانێ ، ئەنجاوەکـــونێ ، ئەوەتـــانێ ••• ) یان لە دوای راناوی ئیشاریەوە ••• هتد •

بە هەرحاڵ لێرەشدا چەند گیروگرفتێك ورووژاو قووڵکردنەوەیەکی دەوێ‌و لەوزەی ئێرەدانیەو لە لێکۆڵینەوەکەی خۆمدا باری سەرنجی دەدرێتێ •

٥ ـ بە هەموو کەموکوورییەکەوە خستنە بەرچاوی قاڵبی « ئەوانێ » کارێکی پەسندەو دەبێتە جەمسەرێك بۆ دۆزینەوەی هەندێ لایەنی شاراوەی زمانەکەمان ، کە بەر لە مامۆستا ، ئەوانی‌دی لێی‌نەدواون •



— ٩ —

❋ پوختەی بۆچوونی ( د• ئەورەحمانی حاجی مارف ) لە ـ وشەرۆنان ـ ەکەیدا[٣٩] :

---

(٣٩) وشەرۆنان لە زمانی کوردیدا ، ١٩٧٧ ل ٧٨ . تا رادەیەك بەشوێن‌کەوتنی چەند نووسینێکە ، دەربارەی هەمان مۆرفێم‌و نیمچە لێکۆڵینەوەیەکە .

**بۆ باری سەرنج :**

لە رۆژی ١٩٧٧/٦/٧ ـ دا کە ئەم بەحسەم بە تەواوی گەیاندە کۆڕی زانیاری ، دوکتۆر چاوی بە بەشەڕەخنەی سەربە نووسینەکەی خۆی کەوت‌و بە ئینسافەوە گوتی : « حەزم دەکرد زۆر بەخەستی لەسەر منت بنووسیایە » ئەوەندەی دیکە هانی‌دام کە لەم جۆرە لێکۆڵینانەوە بۆ خزمەت بڕەتێین . لە هەمان کاتدا گەلاڵەی بەرهەمێکی نازداری لەبەر دەستدابوو « ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، مۆرفۆلۆژی ، بەشی یەکەم ـ ناو » لە ١٩٧٩ دا چاپ‌کرا . ئەم بەرهەمەی منیش ـ لە نەئامەدیمەوە ، بووە پێش‌کەوتەی پاش‌کەوتە ١٩٨٠/٣/٢٠ ـ ئالانی .

١ ـ پاشگری ( ەوە / وە ) دەورێکی گرنگ دەبینێو وشـــەی نوێ پێکدێنێت •

بەرای ئەو ، واتا سەرەکیەکانی ئەمانەن :

أ ـ گۆڕینی مەفهوم : کردن ⟵ کردنەوە •

ب ـ گۆڕینی واتا : بەربوون ⟵ بەربوونەوە •

ج ـ گەڕانەوە : ڕۆیشتن ⟵ ڕۆیشتنەوە •

د ـ دووبارە بوونەوە : نووستن ⟵ نووستنەوە •

---

٢ ـ ئاشکرایە ، کە ـ ەوە / وە ـ لە کرمانجیی خوارووداپاشـــگرە ، ـ ڤە ـ ش لە کرمانجیی سەروودا پێشگرە •

٣ ـ دوکتۆریش قـوتکـردنـەوەی ئـافیکس ، یـان بەنـدی دەنگی ، بەلێدانەوەی هەندێك : پیتی پەیوەندی ••• بەدوای بزوێنەوە+ئەو پاشگرە ، بە فەرەزیاتێکی بێسوود ، دادەنێ •

٤ ـ بەرەو ئەوە نیگادەدا کە تێکڕای پاشـــگرەکە « ەوە » یە • دواتر دەڵێ :

ـــ ( هێشتا پێویستی بە لێکۆڵینەوەی قووڵترهەیە ) •

## ئەنجـام

١ ـ لـە بارەی دیاردیکردنی چوار واتاکەیـەوە لـە شـــوێنی خۆی ، لێیدەکۆڵمەوە • کە ئەرکێش بـە واتـا ـ دەردەبڕێ ، بەلای منەوە جێی ڕەخنەیە •

٢ ـ کە دەڵێ : « پێویســـتی بە لێکۆڵینەوەی قووڵترە » ئەوەیدا بـە دەستەوە کە تا ڕاددەیەك لێیکۆڵیوەتەوە •

٣ ـ بڕیاری داوە کە لە کرمانجیی خوارووودا ، یان بڵێین نێوەڕاست ، بریتیە لە ـ ەوە / وە ـ بەسەڵتی لێی ناسەلمێنرێ و نیشاندانی بەو دووفۆرمە دوودڵی دەگەیەنێ •

٤ ـ وەك زمانەوانەکانی‌دیکە ، هەر ئەوەندەی پیشانداوە کە بە دوای چاوگ‌و کارەوەبێ ، بەکارهێنانی ئەو مۆرفێمە لە مەیدانی وشەسازیدا بەرفراوانترەو ، دەبووایە پێزی پێ‌بدایە •



— ١٠ —

* نووسینێکی دیکەی بە تەوژم لە بارەی مۆرفێمی دووبارەوە :
دوکتۆر جەمال نەبەز ـ لە دووتوێی کتێبێکی هەڵوێست ناسکدا لە ئەو مۆرفێمە دواوە(٤٠) •

لە گوتەیەکی سەرەتای کتێبەکەی ، دەردەکەوێ کە ـ دوکتۆر ـ نەبەز ـ لەو ـ دەمەقاڵێەی کە لەسەر ئەو مۆرفێمە رووی‌داوە بەئاگایە ••• کە دەڵێ ( بۆ ـ ل ٢٠ ) :ـ

(٤٠) زمانی یەکگرتووی کوردی ـ چاپی بەرلین ، ١٩٧٦/٦/١٦ •
ئەم کتێبە دەربارەی مەسەلەیەکی ئەمپەڕاوپەڕە ، لە چەند هەڵوێستێکیدا ، زەمینەیەکی خولقاندوە بۆ چەندوچۆن ـ مناقشە ـ مامۆستا زمانەوانەو لە مەسەلەی چارەنووسی زمانەکەماندا ، رایەکی تازەی دەربڕیوە . ماوەیەکی بەرینەو لەمێژە خۆی بۆ ئەم کارەپیرۆزە، تەرخان‌کردوە ، ئێستاش لە بەرلیندا مامۆستای ئێتنۆلۆژیای گەلە ئێرانیەکانەو هەروەها زمانی کوردی‌و ئەندامی کۆڕی لێ‌کۆڵینەوەی زانستانەیە . ـ بۆ هەمان سەرچاوە ـ .

« خۆئەگەر هاتو لەسەر پێشگری ـ ڤە ـ وە ـ وتـارێك نووسرا ، ئەوا نابێ کارێکی وابکرێ ، ئەگەر شارەزایەك خوێندیەوە ، بلێ : هەمووی دووپاتکردنەوەیەو بەچەند دێڕێك دەوترا »[٤١] •

ئەوەیانی تائێرەو ئنجا بۆ لاپەڕە ( ٢٩ ، ٣٠ ) ی هەمان سەرچاوە :

« پێشکۆی ـ ڤە ve ـ و پاشکۆی ـ وە we / ئەم دەورانەی خوارەوە دەبینێ :

« ١ ـ یان بەشێکە لە تەن ( جسم )ی چاوگەی کار ( مصـــــدر الفعـــل ) ەکـە خـۆیو جـوێ نـابێتـەوە لێی ، وەك ئـەوەی دەڵێت : ـ بووژانەوە ، کولانەوە ـ چونکە ـ بووژان ، کـولان ـ بە تەنیـا هیـچ مانایەك نادەن بەدەستەوە ، وە بەتەنیاش بەکارناهێنرێن ، واتە لـە کوردیدا ( دەبووژێ ، دەکولێ ) نیە •

٢ ـ یان بەشێك‌نیە لـە چاوگی کارەکـەو پێیـەوە دەلکێت . ئـەم کارانەی خوارەوە دەبینێت :

١ ـ مانای کارەکـە بەجارێك دەگـۆڕێت ، وەك ئـەوەی دەڵێت : خوێندن ( خوێندنەوە ) بە تەنیا مانایەکی تایبەتی هەیە ، وشـــــەی ( دراســـة ) یا ( غناء) ی عەرەبی دەگرێتەوە ، بەلام کە [ وە ] نووسێنرا بە پاشکۆکەیەوە ئەو دەم ماناکەی دەگۆڕێ ، دەبێتە ( قراءة یا مطالعة ) •

---

(٤١) بەبڕوای من دوکتۆر راستی نووســیوە ، دەبوایـە ئەوانەیکە بەناوی رەخنەو لێکۆلینەوەوە بۆی دابەزیبوون ، نوێکارانەو بێکوتانـــەوە بوونایە . ئەمەیان بەچاوپۆشێن لە نووسینو نیگای تایبەتی بڕێ لەو نووسەرانەیکە خرانە بەرچاو .

واش چاوەڕوان دەکرێ کە ئەم لەوان باشـــتر لێیوردببێتەوەو هەندێ لایەنی شاراوەی لێوەدەربخاو تەوژمی ئەمکێشەیە کزبکا ؟!..

٢ ـ یـان دووپاتکردنـەوەی کـارەکـە ، دەگـەیـەنێت ، وەك [ چوونەوە ] بەشێك نیـە لەو چاوگەی ( چوونـەوە ) مـانـای تایبەتی ( چوون ) ( ذهاب ) ی عەرەبی دەگەیەنێ ، بەڵام کـە ـ وە ـ نووسـێنرا بە پاشکۆکەیەوە ، ئـەو دەمـە ماناکەی دەگۆڕێ دەبێتـە جـارێکیدی [ چوون ] واتـا ، دووپـات کردنەوەی [ چوون ] واتا ( عودة ) •

٣ ـ ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێبازی کارەکە بۆ پاشـەوەیـە ، وەك ( سڵەمینەوە ) •

وە / ی کوردی لێرەدا دەوری پێشـکۆی فارسیی تـازە ( بـاز ) دەبینێ بۆ وێنە ( بازکشیدن ) بە مانای ( کشانەوە ) •

ئەوەی شایانی باسـە ئەوەیە ئـەم ( ڤە / وە ) یەی کوردی لـە هەنـدێ شێوەی ئێرانیەکاندا بەکاردەبرێ بۆ وێنە لە شێوەی ( گێلەکی ) دا ، کـە شێوەیەکە هێشتا بەتەواوی ساغ نەبۆتەوە کە سەر بە چ کۆمەڵە زمانێکی ئێرانیـە ، وشـەی [ ڤەکـون Vekon ] بۆ [ بکەوە = بکەرەوە ] بەکاردەبرێ ، کە بە فارسی [ بازکون ] ە ، بەڵام وا دیارە ئەم باسـە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی فراوانتر هەیە کە جێی ئێرەنیە » •

دیسان لەسەر ئەم لێکۆڵینەوەیەی دەڕواو ، ئەمەش کورتەیەتی :

« پاشکۆی ـ وە ـ ی کرمانجیی نێوەڕاسـت لە کرمانجیی ژووروشـدا هەیە ، هەر ئەو ئەرکانەی سەرەوە دەبینێ ، دەبێتەوە بـە پێشکۆ ، وەك لە باتی ( ژیانەوە ، شـاردنەوە ) دەگوترێ ( ڤەژیـن ، ڤەشاردن ) وە لە بادینانیدا دەکەوێتە پاشکۆوە وەك ( هاتەڤە ، گەڕاڤە ) •

لە نووسینی ئەدەبیماندا بە پاشکۆ بنووسرێ ؛ ئەوسـتا چۆن دەخوێندرێتەوە هەرکەسە بە ئارەزووی خۆی » •

لە هەمان لاپەڕەدا ، دەڵێ : « بەڕای من ـ ڤە ـ وەك پاشـــــــكۆ بمێنێتەوە ، باشترە » •

لە لاپەڕە ـ ٥٩ ـ شدا ، دەڵێ : « دەنگی ( ڤـ ) شیرین‌و رەسـەنەو [ و ] ی کرمانجیی نێوەڕاست بە ( ڤ ) بنووسرێ ، وەك بنووســـرێ : ( ئاڤ ) نەك ( ئاو ) ، ( رێڤی ) نەك ( رێوی )••• »(٤٢)• ئەمەیانی بەپێی چەند وشەیەك کەدەنگی ( ڤ ) لە ئاوێستادا زەقە ( ل ٦٠ ) •

**بەشـــوێن‌کەوتن :**

— لە رووی فۆرمەوە چۆنی ساغ‌دەکاتەوە ؟

بەپێی بەراوردو لێکۆڵینەوەی لەمەوبەرم ، زۆر ســـاکارانە داویەتی بەدەستەوە :

١ ـ تەنها لە روخساری ( وە ـ ڤە ) دا بەرچاوی خستوە ، وێڕای ئەوە کە بە فۆرمی ( ەوە ) لە زمـانی ئەدەبیمانـدا ، بەدەردەکـەوێ ، تاقـە

---

(٤٢) چونکە ـ دوکتۆر ـ خۆی زمانەوانە ، ســـەرنجی هەندێ لێدانەوەو زاراوەی دەدەم :

١ ـ « وەك ئەوەی دەڵێیت . / کە دەڵێیت . . .

٢ ـ چاوگە ، چاوگ . / یەکێکیان ؟

٣ ـ مۆرفیمی ( وە ) « . . . ئـەم دەورانە ، ئـەم کارانـە . . . . . » راستتر / . . ئەم ئەرکانە .

٤ ـ پێشکۆ = پێشگر ، پاشکۆ = پاشگر » .

بەراستی نازانم ، چونکە بەر لە خوازەکاری بەم چەشنە بەکارهاتون : ( پاش + کۆڵ = پاش‌کۆڵ ) : ئەو شتەی کە سوارە دەی‌خاتـە دوای پشتی : ـ ملحق . بەرانبەرەکەی ( بەردەم )ە ، نەك ( پێشکۆ ) بـەو حیسابە پێشگر دەبێتە ( پێش پاش ) . کـە دەڵێ « پاشکۆی ( وە ) دەنووسێ بە ( پاشکۆی وشەوە ) ، وای لێدێ ( . . . دەبێتە پاشگری پاشگری . . . . . )راستتر کە : ( پاشکۆی ـ وە / لکابەوشەوە ) جگە لەوەش بۆچی پاشگرو پێشگر یان پێشبەندو پاشـــــبەند نەبێ ؟ . لە کاتێکدا کە بۆ ( ملحق )ی پریپۆزیشن ، پاشکۆ ـ بەجێیە .

هێمایەکیشی بۆ نەکردوە ، یان بزوێنی بەرایی چیەو چ نیە ؟!
لێی بێدەنگ بووە .

٢ - کە دەڵێ :- لە وێنەی ( بووژانەوە ، کولانەوە ) دا ، پاشکۆی - وە -
بەشێکە لە « جسم » ی چاوگەی کارەکە - ئەم بڕیارە ، هیچ
بەڵگەیەکی زانستی لەگەڵدانیە :

أ - کە ناوی پاشکۆی لێهێنا ، واتا : شتێکی سەربەخۆیە و لە
جەوهەری وشەکەنیە ، کە ببێتە بەشێکی بنجیی واتا : ناوی
پاشکۆی بەسەردا نابڕدرێ !! دواتر گەردان نەکردنی
« کولا » و گەردان کردنی ( کولانەوە ) پەیوندی بە
نهێنیەکیدی زمانەوە هەیەو بەهیچ جۆر نیگای نەداوەتێ
ئێرە ، جێگای ئەو یەکالاکردنەوەیە نیە ، بەلام بۆ نموونە ئەم
چاوگە دەخەمە روو : - گرمان - گرماندن - بەحەلێبی
( مامۆستا ) دەبێ [ اندن ] یش ، بەشێکی بنجی بێ ، چونکە
- گرما ، دەگرمێ - بەبێ ئەو پاشگرە ، گەردان ناکا .
ئەم بۆچوونە رواڵەتیە لە رای مامۆستا [ عەمید ئەحمەد ]یشدا ،
بینرا ( بۆ هەمان گوتاری لەمەوبەر ) کە گوتی : کۆمەڵە پیتی
- ەوە - کە واتا دەگۆڕی بەشی بنجیی وشەیە !!

٣ - وە - ی زمانی کوردی بە پێشگری « باز » ی فارسیی تازە
پێکاڵ پێکدەکا . ئەم بەراوردە [ کە بابەتی خۆیەتی ] نەدەبوو ، وا
ساکارانە بیخاتە روو .

لەبەر ئەمانەی خوارەوە :

أ - ئەو ئەرکە ئەفسوونیەی کە مۆرفێمە کوردیەکە دەیبینێ ، بە تەنها
وشەی « باز » ی فارسی ناحەوێتەوە .

ب ـ ده نەبەز / کـە لـە فارسی‌ی کۆن‌و تـازەدا کاردەکـا ، ئـایـا دیاردەیەکی ئەم مۆرفێمە کوردیە لـە فارسی‌ی کۆنـدا هـەیـە یان‌نا ، کە هەیشە لەگەڵ چ شێوەیەکی کوردی ، دوورو نزیك دەبێ ؟

٤ ـ ئەوەی کە تازەبێ لە بۆچوونی ئەمدا دووشتە :

أ ـ لە شێوەی ـ گێلەکی ـ دا ، وشـــەی « ڤەکون ـ بکەرەوە » بەکاردەهێنرێ ...

ب ـ وای پەسنددەکا کە پاشکۆی « وە » لە زمانی ئەدەبیـــدا بـە ( ڤە ) بنووســرێ ... یـان ( ڤ ) لـە باتی /و/ ی دەنگ بنووسرێ ، لەبەر رەسەنی‌ی یەکەمیان . لەمەوپێش نموونەکانی خرانەروو .

**ئـاورێك :**

گریمان هەرچی « و » ی ئاوێستابوو ، بە « ڤ » ســـاغ‌کرایەوە ، هەمان دیاردە لە کرمانجی‌ی سەروودا ، بەڵگەی ئەوەبێ ...... ئێمە لـە زادەی ئەمڕۆمان دەدوێین[٤٣] .

سازو سازگەی « و » یەکێکە لە پێك‌هێنەکانی زمانی ئێســـــتامان لەمپەڕاوپەڕی زەمینەکەماندا ، تەنانەت دیاردەیەکی زاڵە لە بەشە دیالێکتی گۆران‌و هەرێمی گۆران‌و گەرمیاندا و بە هەمان دەنگسازی زمانە ئەدەبیە یەك‌گرتوەکەمان خۆی پێ‌تەسەل‌کردوە ، حەوت ئەوەنـدە دەنگی « ڤـ » شـــیرین بێ ـ وەك بەلای ئەوەوە ـ ناتوانێ دەنگی « و » لرف‌بدا ، دوو

---

(٤٣) ئەوەی لە راستی یاخی‌نەبێ ، وەك سرووشتێکی پاك ، ســــــەیری ئاوێستا دەکا . بەڵام کام ئاوێســــــــتا ؟ کـــە دەیان‌و پتر گۆڕانی بەسەرداهاتوەو سەردەمێکی تار ژاکاندویەتی ، تەنها بۆ بەڵگەکـاری لە مێژووی زمان‌و ئیتمۆلۆژیدا ، بۆرەسۆراخێکی پێ‌دەکرێ‌و بەس .

دەنگی « ڤ » بە تایبەتیو « و » بە گشتی ، تێکەڵی هەیبتو دەروونن ••
شکڵەپیتی تایبەتیان بۆ چەسپاوە ، بوونە خۆراکی ڕایەڵـە دەنگەکـانی
کورد •• زیادوکەم لچولێو دەقیان پێوەگرتون • لەوەش دەگەڕێم کە بە
ئامێرەدەنگ‌پێو ، قورسیی « ڤ » و سووکیی « و » تاقی‌کراوەتەوە •
دیسان کە نووسرا « رێڤی » و تیشکی‌چاوی لێ‌هەڵبەزیەوە ، بە ـ رێوی ،
روا ، رواس ـ ناخوێنرێتەوە ، هەروەها بە پێچەوانەش ، ئەوەش ئـالاّ
بەدەستی کرمانجیی سەروو کە دەفەرموێ :

« ابن السـبیل ـ رێوی ـ هەڤرێ = رفیق و صـاحب
مزجات = هەندك و پڕ = جَم ّ و لُبد و کثیر ـ، ه »
« نووبهارا ئەحمەدێ خانی »

یان کە نووسرا :ـ هاتەڤە ـ هەمان بیچم بە ـ هاتەوە ـ ناخوێنرێتەوە
••• ئەگەر بەهەردو شـێوەش بنووسرێن‌و بخوێنرێنەوە ، با خۆمـان
بدزینەوە لە زانستە زمانیەکان‌و لاف‌لێدان لە پێناوی خەملاّندنی زمـانی
نووسیندا ، دێ‌بەدێ‌و گەڕەك بەگەڕەك چی دەڵێن‌و چی دەنووسـن
خۆیان سەرپشك‌بن !!

لە لاپەڕە ـ ٣٠ ـ دا گوتی :

« وادیارە ئەم باسـە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی فراوانتر هەیە »
کەواتە ددانی بەوەدانـا کـە بەفراوانی لێی‌کۆڵیوەتەوە • بەرای مـن
لێی‌نەکۆڵیوەتەوە ، چونکە :

أ ـ لەبارەی قەبارەو فۆرمەوە ، بەبێ هیچ شی‌کردنەوەیەك ، گوتی :
« ڤە ـ وە » •

ب ـ لەبارەی ئەرکیشەوە :

١ ـ لەشـــوێنی خۆیـدا لـەگـەڵ رای چەنـد زمانـەوانێکیدی ، لێیدەکۆڵمەوە •
٢ ـ تەنها تاقە ئەرکێکی لێوەردەگیرێ •

ئـەویش بـە پێی لێدانـەوەو نموونـەکـانی ـ بـە بۆچوونی من ـ سەرناگرێ ، دەڵێ : « دووپاتکردنەوەی [ چوون ] واتا [ عودة ] •
ـــ عەودەت = گەڕانەوە • / جیاوازە لە ـ چوون ، چوونەوە ـ •

کورتەی قسە :ـ ئەم تاقە ئەرکەش لە نێوان ـ دووبارەو دووپـــات تاکیدو گەڕانەوە = ( عودة ) دا ، ئاڵۆزکاوە •



* تائێرە زنجیرە نووسـینێکمان هەڵپشکنی دەربارەی مۆرفێمی دووبارە ، ئەگەر تروسکەیەکیش بەدی کرابێ نەگەیشتینە ئەنجام •

نیشانەی رابوردووی نزیك لە هەندێ شوێندا هاوروخسـاری مۆرفێمی دووبارەیەو لە ئەرکدا زۆر لێکدی جیاوازن‌و بەیەکیشەوە جووتە دەبەستن •

---

زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ١

**لیژنەی - ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی :** (چاپی ١٩٧٦)

لە لاپەڕە - ١٧٧ - ١٨٣ - دا ، بـە شێوەیەك بۆی چووە ، تائێسـتا - بەڕای من - ئەوجۆرە[٤٤] رایە لە زمانەکەمـانـدا - دانەبەزیوە ، بەپێی بەراوردو لێکۆڵینەوە ، باری بۆچوونم دژوێستیانە •

**بۆچوونی لیژنە ، بەکورتی :-**

أ - دروست‌کردنی رابوردووی نزیکی تێنەپەڕ :

١ - لە کرمانجیی سەروودا - لە پێشەوە راناوی نەلکاو + صیغەی ناوی کارا = اسم فاعل + راناوی لکاو ، وەکو :

---

(٤٤) لە کتێبە رێزمانیەکانماندا ، ئەم زاراوانە لەکـاردان :- رابوردووی گێڕاوەیی ، نەقلی ، تام ، نزیك ، دوور . لـە فارسیشدا تەنهـا : قریب ، نقلی . منیش : بەرانبەر بە « دوور » زاراوەی « نـزیـك » بەکاردەهێنم .

« ئەز ڤستیمە ـــ ئەم ڤستینە
ئەو ڤســتیە ئەو ڤستینە » | بۆتان

٢ ـ لە کرمانجی‌ی خوارووودا ـ بەهەمان دروست کردنی سەرەوە :

« نوســتوم نوستوین
نوســتوە نوستون »

٣ ـ ئەم زێدەیە ، واتە بزوێنی دوای صیغەی ( ئەو ڤستیە ) فعل مساعدە = Verbtobe • لە زمانی فارسیدا ( اســـت )ی خەبەریە •

٤ ـ دەم راستی لیژنە ، دەڵێ :(٤٥) « لێکۆڵینەوەم ئەوەیە ، زیادی‌ی دوای رستەی اسمی ، بۆ کەسی سێیەمی تاك ، راناوی لکاوە •• وەك هی کەسانی‌تر •• کاری رابوردووی نزیکیش بۆ کەسی سێیەمی تاك ـ لە ڕواڵەتدا ـ وەك رستەی اسمی وایە ، دەبێ هەمان زیادەی بۆ بەکاربێ ، کە گوتت : ( ئەو نووستوو ) وەك ئەوە وایە گوتبێتت: ( ئەو شوان ) ، چونکە لە (ئەو شوانە)دا ، راناوی ـ ە ـ پێویستە لە ( ئەو نووستووە ) شدا ، وایە •

---

(٤٥) بۆ ل ـ ١٧٨ ـ ، ئەم بەراوردەی کردوە :
نوستم ـ م من کوردم ـ م
ئەو نوست ... ئەو کوردە ـ ە ـ »
تێبینی : ئەم بەراوردەی لە رابوردووی رەبەقدا کردوە ، نەك نزیك ، بەو پێیە ، دەبێ بگوترێ :
( ئەو نوستە ) وەك ( ئەو کوردە ) .

٥ ـ ماموّستا نووری عەلی ئەمین ، دوای ئـەو دەڵێ : من بزوێنی ( ە ) ی ( نووستووه ) به فعل مساعد دادەنێم(٤٦) •

ب ـ دروستکردنی رابوردووی تێپەڕ : راناوی نەلکاو + صیغەی کار = فعل + حەرکەی [ ە ] دێت به شوێنیدا ، وەك :

١ ـ له کرمانجیی سەرووداا :

« من گرتیه ـــ مه گرتیه

وی ، وێ گرتیه ـــ وان گرتیه »

٢ ـ لـه کـرمـانجیی خـوارووداا : رانـاو دەبێت ، نـابێت و + حەرەکەی ( ە ) :

« من گرتوومه ـــ ئێمه گرتوومانه

ئەو گرتوویه ـــ ئەوان گرتوویانه »

لەم شوێنەدا ، راناوی [ ە ] مفعوله •

---

**پوختەی بۆچوونەکەیان :**

١ ـ له زمانی کوردیدا شتێك نیه ، سەربەخۆ پێی بگوترێ ، نیشـانەی کاری رابوردووی نزیك •

٢ ـ ئەگەر رێژگەکه ( صـیغة ) تێنەپەڕ بوو ، وەك ( نووسـتوه ) بزوێنەکەی دواوەی یان راناوی کارایه یان کاری یاریدەدەره ، بـه قیاسی رستەناو ، وەك : ( ئەو شوانه ) •

---

(٤٦) ماموّستا نووری عەلی ئەمین له رای سـالانی پێشووی ( بۆ گرتنی کەلێنێکیتر له زمانی کوردی ) پەشیمانه ، که نووسیویەتی « وه »ی پاشگری نەقلی ، له مەولا لەم دوانەش لادەدا ، بۆ ـ کتێبی رێزمانی پۆلی شەشەمی ئامادەیی چاپی ـ ١٩٧٦ •

٣ ـ ئەگەر تێپەڕیش‌بوو • وەك : ( گرتومە ، گرتومن ) ئەوا هەمـــان بزوێن ، راناوی بەرکارە •

٤ ـ لە کاتێکدا راناوی بێجگەی کەسی سێیەمی تاك ـ بە ســـــفەتی بەرکار ـ پێیەوە لکا ، ئەوا راناوە بەرکارەکە لە جێی بزوێنەکەیە •

---

**لێکۆلینـەوە :**

أ ـ لە رووی گەردانەوە :

١ ـ کە دەڵێن : ( راناوی نەلکاو + •••• ) هـەرگیـــز پەیونـدی بـە وشەگەردانیەوەنیە ، چونکە راناوی جوێ ، وەك: ( من ، ئەز ، ئەو ) ناچنە گوژمەی کارەکەوە ، ئەمە قسەیەکی زیادەو هیچ کارناکاتە سەر وشەسازیەکەی ئێرە !!

٢ ـ کە دەڵێن : ( اسـم فاعـل + رانـاوی فاعـل ) • ناســــەلمێنرێو ژیربێژیانەنیە ، چونکە ئاوەڵناو کارابێ یان بەرکاربێ ، خۆی لە کار یان چاوگ دروست‌دەبێ • دیســــان راناو ـ گەڕوكو لەقە بەتەنێ نابێتە نیشانەی جۆری کار ، وەك :

( خواردم ) رابوردووی ردبەق • لە ( نانم‌خوارد ) یشدا ( خوارد ) هەر هەمان کارە • بەوپێیە دەبێ رێژگەی ( گرتو ) بەبێ بزوێنەکەش هەر رابوردووی نزیك‌بێ ، ئەمەش رووی‌نەداوە !

ـــ گریمان بۆچوونەکە راست‌بێ کە ( نووستو ) لـە رســــتەی ( ئازاد نووستوە ) دا ، ئاوەڵ ناوی کارابێ و بزوێنیش راناوبێ ، ئەوســا رستەکە ( فعلی ) نابێو ( اسمی ) دەبێو کـار لەکایـەدا نامێنێ • لەلایەکی دیکەشەوە بەهەمان دەســتوور کە بڵێین : ( من فرۆشــیار + م ) دەبێ ( فرۆشیارم ) تێکڕا کـاری رابوردووی نزیـك‌بێ ؟ چونکە بـەموو لـەو هاوکێشەیە لای‌نەداوە •

ـــ ئەگەر بیانوو ئەوەبێ کە کاری ( نووستوە ) بێتو بزوێنەکـەی پێوەنەبێ ، قاڵبی ( نووستو ) وەك ( خەوتو ) دەدا بە دەســـتەوە ، کـــە ئاوەڵ ناوی کاران •

بە باوەڕی من ئەو بیچمە لە خێڵی رێکەوتە روخســارەو پەیوەندی بە وشە داتاشینەوەنیە ••• وشـــــــە هەرچۆنێك بێ ، بە لێکەمکردنو لێ زیادکردن ، قاڵبەکەی تێكدەچێ ، جا لە قاڵبێکی دی بکا یان نەکا ••• کەمو زیادکردنیش بەبێ یاسای تایبەتی کارەسات دەێتەوە !

ـــ هەر لەبابەت رێکەوتە روخسارەوە ، وشـــەی ( کەوتن ) کـە چاوگەو ، بە درێژایی گەردانەکەی ، رەگو قەدی بریتیە لە « کەو » لـەم کاتەدا کە دەڵێین : « کەو » رەگی « دەکەوێ » یە ، ئەندێشـــەی ئەوەی لێناکرێ کە لە « کەو » ی باڵندەوە گەردانی پێکراوە •

یان وشەی « کەوتن » کە چاوگ بێ یان رســـتەبێ = ئەوانە داری ـ کەوتن ـ یان ـ بەدەمدا ( کەوتن ) ـ لە دوو روخساری دوەمدا ، ( ن )ی راناو ، کاری یاریدەدەرە ، لە کاتێکدا بەبێ یاریدەی وشەی دی بگوترێ روخسار یەك روخسارەو هیچیان بنکەی ئەویدیکەیان نیە •

٣ ـ گریمان بزوێنی دوای « نووستوە » راناوی کارایـە بۆ ئاوەڵ ناوی کارای ـ نووستو ـ و لە کرمانجیی خوارووداا •••• بـەڵام لە لقی بۆتاندا کە دەڵێن :

( ئەز ڤستیمە ) وەك ( نووستوە ) تێنەپەڕە جیاوازییان نیـە ، لـــە دۆخی گوزارشـــــدا ، بەهەمـــان بۆچوونی لیژنـە ، دەبێ بزوێنی دوای ( ڤستیمە ) ببێتە ، راناوی کار • بە بەداهەتیش دیارە کـــــە « م » پێش بزوێنەکە بکەرە ، کەواتە تێکڕای « م + ە » هەردووکیان دەبنە رانـاوی کارا لە کاتێکداو بۆ تاقە کارێك ؟! ئەمەش لە زماندا رووی‌نەداوە ••• !!
ئەی چارچیە ؟

أ ـ بابزوێنەکەی « ڤستیمە » رانـاوی بەرکاربێ • بـەڵام چونکە کارەکە تێنەپەڕە ، هەرگیزناشێ •

ب ـ با بزوێنەکە زیادەبێ • ئەوسا دەبێتە « ڤستیم » ئنجا بەچ بزانین کە رابوردووی نزیکە ؟

٤ ـ کەواتە هەرئەوەمان بۆمایەوە ـ بەپێی ئـەو بۆچوونە ـ بزوێنـەکـە لەیەكکاتدا هەموو شتێکە : کارایە ، بەرکارە ، کاری یاریدەدەرە •••

---

ب ـ لە رووی گوزارشو اسنادەوە :

١ ـ نووسیویانە لە وێنەی ( گرتسن ) دا کە کارەنزیکەکە راناوی بێجگەی کەسی سێیەمی تاکی لـەتـەكدایە ؛ دواینەکـەیـان « ن » لـەئێرەدا مەفعوولەو جێگری بزوێنەکەیە •

من ناڵێم لێرەدا ( ن ) بەرکارنیە • بەڵام بەسـەـفەتی جێگر ، بێتو بزوێنەکە بێتەوە ، نابێ راناوی کۆی لەگەڵبێ ، بـەنموونـە کورد دەڵێ : « گرتومنەتەوە » بە بۆچوونی ئەوان دوو رانـاوی بەرکار ـ تـاك ، کۆ ـ ئاوقەدبوون ، مەتنیق رێگەنادا ؛ کارەکە لەیەك سـاتدا ئاراسـتەی هەردووکیان بکرێو لە دۆخی بەرکاریدا !!

٢ ـ بەرای مامۆستا نووری عەلی بزوێنەکە کاری یاریدەدەری ناتەواوە •

دەڵێم : زمان بەبێ هۆو سـەبارەت کاری یاریدەدەر ناخوڵقێنێ ، کارێك کە لە گوزارەدا ئەو پەڕی هێزی هەبێ ، یاریـدەدەری بۆچیە ؟ ، بگرین : « ئازاد نووست » کارو مەبەست تەواوە ، بشڵێین :

( نووستوە ) ئەویش هەر تەواوە •

ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ : کە بە یاریدە دەرەکە ئاوەڵناوبکا بە کار ، دەبێ دەقی ـ ئەو ( فرۆشیارە ) ش کاری رابوردووبێ ؟!

Verb to be

سازاندنی ئەو ـ ڤێرب توبی ـ یە لەم رستـــــەیەدا بەتاڵدەبێتەوە :
ـ ئازاد بوو ، ئازاد بووە ـ کاری رابوردووی نزیك لە گۆڕێدایـە ، بـە
ـ هاوکێشەکە یاریدەدەری یاریدەدەر ـ سەری گرتوەو گوزارەش ناتەواوە،
بەحـەلێبی ( ئازاد کوردە ) دەبوو ( ئازاد بووە )ش ـ کـە بووە کاربێ ـ
گوزارەش تەواوبێ ؟

**نیگایـەك :**

هەموومان لەوە بەئاگاین کە زمانی کوردی دیاردەیەکی رەسەنی هەیە لە وشە تاشیدا ، ئەویش گەردانکردنە بە پێنج چاوگە ریشـــەییەکان بۆ کارەکانو دواتر بۆ ئاوەڵناوەکان ، دیاردی کردنی زەمان ـ لە کوردیدا ـ ئەرکی نیشانەو مۆرفێمی تایبەتیە ، بەنموونە ، نیشـــانەی رابوردووی بەردەوامی ، نیشانەی رانەبوردوو ، داخوازی ، گێڕاوەیی .... هتـد .
کەواتە راناو ئەو دەورە نابینیو دەوری اسنادی پێتەواودەکرێ .

ئەمە بڕوامە :ـ بێتو ئەو نەزەریـە تازەیـە رەچاوبکرێ ، گـەردانی کوردی ، دەشێوێو سەرناگرێ .

## ئەنجـام

١ ـ کاری رابوردووی نزیك دەبێ نیشانەی تایبەتی نەبێ .

٢ ـ وەرگرتنی بەشـــێکی مۆرفێمی رابوردووی نزیك و فەرامۆشکردنی بەشێکیدیکەی .

٣ ـ کارێکی پیچەوانە لەگەردانی کاردا . واتە لە ئاوەڵناوەوە بۆ کار ؟!

٤ ـ لە یەكساتدا دوو راناوی کارا یان دوو راناوی تاكوکۆی بەرکار ، بۆ یەك کارو لە هەمان کاتدا کاری یاریدەدەریش بن .



— ٢ —

* ئەوە روونکرایەوە ، کە لیژنەی زمانوزانستەکانی ( رێزمـــانی کوردی ) لە نیشانەی رابوردووی نزیکدا ، تەنها حیســـابێکیان بۆ تـاقـــە بزوێنەکەی کردبوو لە دۆخی تاکی سێیەمداو بە بۆچوونێکی وا کە لەگـەڵ وشەسازیدا ، ناگونجێ •

لیژنەی زمانو ئەدەبی کوردیی ـ کە بریتیە لە هەشــــت ئەنـدام ـ پۆلی شەشەمی ئامادەیی ـ ٩٧٦ ل ١٥ ـ ، بە پێچەوانەی لیژنەکەی ( رێزمانی ئاخاوتن ) نیوە ناچلآنە نیشانیانداوە ، تەنها شکلی « و » یان بەبێ ئاوڕدانەوە لە بزوێنەکەی ـ وەك نەبێ ـ دەستنیشان کردوەو بەس •

جارێ ئەمەش دەقێکی بۆچوونەکەیانە : « رێژەی رابوردووی تەواوی ئیخباری : رابوردووی سادە + پاشگری « وو » بەدوو واو ، بۆ چاوگـــە ( ت ، د ) یەکان • بۆ چاوگەکانی کەش ، رابوردووی سادە + پاشـــــگری ( و ) ـ بەیەك واو ـ ، وەك ئەم نموونانە :ـ

أ ـ | هات + وو ⟵ هاتوو
| چاند + وو ⟵ چاندوو

ب ـ | کێلا + و ⟵ کێلاو
| دڕی + و ⟵ دڕیو » •

---

**تـۆژینـەوە :**

وەك گوتم ئەم لیژنەیە کارەکەی پێچەوانەی لیژنەی کۆڕی زانیاریە ، بەشی یەکەمی ـ نیشـــانەکەیان ـ تاوداوەو نموونەکانیشـــیان وەها داون بەدەستەوە کە کورد بڵێ : « کراسم دڕیو » نەك بڵێ : « دڕیوە » •

هیچ هێمایەکیان بە)بزوێنەکە « ە » نەداوە • هیچ نەبێ ـ وەك دیاردەیەکی زمانەکە ـ قەرەی نەکەوتوون ؛ لەمەدا کە کاری رابوردووی نزیکیان لە رابوردووی سەڵت ، یان ـ رەبەق ـ وەرگرتوە ، لە بەداهەت لایان‌نەداوە •••• واتە وەك لیژنەکەی‌دی ئاوەڵناوی کاراو بکەریان نەکردوەتە بنکەی گەردانی ئەو جۆرەکارە ، بەلاّم ئەنجامەکەی بەدەستەوەدانی چەند قاڵبێکە ـ بۆ مەبەستی کاری رابوردووی نزیك ، گفتیان پێ‌نەکراە ، کە بڵێیی : « ئازاد هاتوو ••• » لەباتی « ئازاد هاتوە » یان بڵێیی « هۆمەر زەوی کێلاّو •••• » لەباتی ( •••• کێلاّوە ) •

چونکە بەپێی گەردان‌و هاوکێشەکەیان لەو روخسارانە بەولاوە ، هیچی‌دیکەیان بەدەستەوە نەداوە ••• لەوەش بەولاوە قوتابیان زەینیان بۆ ناچێ •

سەرەڕای ئەوەش هەندێ لەو قاڵبانە ئاوەڵناوی کاران ـ بەرواڵەت ـ بڕێکیشیان ئاوەڵناوی بەرکارن •• بەلاّم وێنەی « کێلاّو » نە رابوردووی نزیکەو نە ئاوەڵناوی بەرکاری تەواوە ؛ چونکە « کیلراو » باوە •

بڕیاردان لەسەر ئەوە کە نیشانەی نزیك یان ( ئەوان واتەنی ) :

١ ـ پاشگری « وو »

٢ ـ پاشگری « و »

بە یەك / واو ، دوو / واو ـ کارێکی رواڵەتانەی ناچڵەو لەمەیدانی دەستوورسازیدا لەسەرمان بەزەحمەت‌دەکەوێ ؛ زمان ئەوەندە رەهانیە کە لەیەك شێوە ئاخاوتندا ، تاقە نیشانەیەك بۆ یەك مەبەست ـ بەبێ ئاوڕدانەوەی باری دەنگسازی ، ناوی دوو پاشگری بۆ دابنرێ • زاتەن پاشگریشی پێ ناگوترێ !!

ئەم مەسەلە رواڵەتیە پەیوەندی بە دەنگ‌سازیەوە هەیە کە / و / ی نیشانەکە چ وەختێك بە دەنگدار دەردەبڕدری‌و چ کات وەك بزوێنی

( وو ) ی درێژ دێتە بەرچاوو گوێ لێرەدا ناوچە تـا ناوچە دەوری خـۆی تێدا هەیە ، پەیوەندی بە گەردانەوە نیـە کـە بەو دوو روخســـارە ناچڵە دابەزیبێ •

تەنها بۆ باری سەرنج سێ دەربڕین ، دەخـەمـەروو . هۆیەکانیش ، دەهێڵمەوە بۆ تێوقەدی بەرەنجـامیکەی لـەمـەڕخـۆم بەپێی ئـەم ســێ شیرازەیە :

١ ـ هات + وە ⟵ Hatiwe

٢ ـ هات + وە + ت + ەوە ⟵ Hatiwetewe

٣ ـ هات ••• + ۆ + ت + ەوە ⟵ Hatotewe .

❋ بـە هـەرحـاڵ ئـەو دوو لیژنـەیـە ، هێنـاویانە هەریەکەی ، نیشانەپێتێکی مۆرفێمەکەی ســـەربەخۆیانـە وەرگرتوە ، بەچاو هـــەر لایەکیانەوە بەشی دیکەی‌نیەو هێنای بۆ نەکراوە ؛ چۆنی لێ‌بڵێین دوو رای پێچەوانەی ناچڵن ، دیارە بێتو هەر لایەکیان بە راســت دابنرێ ، ئەوی‌دی ناراستە(٤٧) •



---

(٤٧) بەسەرکردنەوەیەك :

١ ـ رابوردووی سادە + پاشگری ـ وو ، و =

أ ـ هێنانەوەی سادە ، کوتومت ئەوە دەدا بە دەستەوە کـە ـ کاری رابوردووی نزیك ناسادە ، یان ـ لێك‌دراوبێ . لـە رووی وشەسازیەوە هەڵەیە ، بەپێی نموونەکانیان وەهـــا دەردەکەوێ .

ب ـ فەرقی سوفیکس‌و پریفیکس‌و نیشانەیان نەخستوە ، لـــە زانستی زماندا هەریەکەو بەشە کەرەســەیەکی تایبەتین ، لێرەدا مەودای جیاکردنەوەیمان‌نیە .

٢ ـ بەو حیسابە دەبێ وشەی ( مردوو ) کاری رابوردووی نزیك‌بێ ؟

## — ٣ —

* ڕایەکی‌دیکەی ( لیژنەی زمانو ئەدەب ) لە کتێبی پۆلی یەکەمی ناوەندیدا ، چاپی – ١٩٧٦ ل ٧٨ – بە بارێکی‌کەدا نووسیویانە :

« پاشگری رابوردووی تەواو بریتیـە لە « ووە » – بە دوو / واو – بەدوای دەنگیەوە ، لە دوای بزوێنەوە بریتیە لە « وە » – بە یەك واو – » •

لەمەوبەر گوتم نیشانەکە دوان‌نیە ، بـە یاســای دەنگسازی چۆنی لێ‌بلێین فۆرمی « ووە » راست‌نیە ؛ چونکە مۆرفیم – لەو بابەتانە یان تاقە« بزوێنێکەو لەگەڵ دەنگداری پێشەوەی بڕگە پەیدادەکـا ، وەك ( ە – ی راستە ، یان ( ا – ی ) توانا ، زانا ••• هتد •

یـان تێکـڕای ( دەنگ + بزوێنــە ) ، وەك : ( دە ، وە ) • یـان [ بزوێن + دەنگ + بزوێن ] ەو بزوێنە بەراییەکە لەگەڵ دەنگی پێشەوەی سەوودادەکا • یان هەر دەنگداری رووتە ، وەك ( د • ن ) بـەلاّم لە فۆرمی جووتە بزوێن و کۆمەڵە بزوێندا ، شتی وا نەبووەو نیـە ، ئـەمـە کاتێـك سەردەگرێ کە هێزی پەستانو کێشی فیزیا هەڵبوەشێنەوە !!

کە نووسیویانە « ووە » جیاوازی‌ی نیە لەگــەڵ ئـەم کۆمــەڵــە دەست‌کردانەدا ؛ « ا + ا ، ە + ە ، ۆ + ۆ » گۆکردنی ئەمانـەش مەحاڵە • هێمانەکایەی جووتە بزوێن یان پتر لەو خێڵەپیتانەوە ســـــەری پێوەناوە کە لەیەك روخســـاریدا ، ئەرکی دەنگدارو بزوێن دەبینن ، وەك بنووسین ( مر / •• اوی ) • لێرەدا /و/ دەنگدارە • ڕێ‌دەکەوێ لە کرکەدا دیفتۆنگ بێتەکایەوە ئەویش ئاراستە بزوێنێکە بۆ ڕاکێشـانی یەك دەنگ بە کارتێ‌کراێکی تایبەتی ، ئەو بزوێنە لە نێوان دوو بزوێندا پەیدا دەبێ‌و حیســـابی کۆمـەڵـە بزوێنی بۆ ناکرێ ، بە لێدانەوەیەکی زانســـتی نەك رواڵـەتی •

کەسێکیش بپرسێ : نیشانە ڕاستەقینەکە چیە ؟! ••• بەبێ بەرەنجامیو بەراوردی تەواو وەڵام دانەوەکە ، نابێتە مایەی دڵنیایی •

**ئەنجامی بۆ چوونەکانیان :**

١ ـ ئاوەڵناویان داتاشیوەو ناوی کاریان لێناوە •

٢ ـ نیوەی پێشەوەی مۆرفیمەکەیان بەدوو فۆرمی سەربەخۆ ، دیاریکردوە • یان نیوەی دواوە بە تەنها •

٣ ـ لیژنە لە نێوان دوو کتێبدا باری لێگۆڕیوە ؛ کەواتە ساغیان نەکردەوە •



— ٤ —

❋ مامۆستا جگەرخوێن ـ لە نیشانەی ڕابوردووی نزیك دواوە ، بەچاو شێوەی کرمانجیی سەروو تا ڕاددەیەك دەریخستوە •

بە ئاڵۆزکاویش لە کرمانجیی خواروودا ، لیی دواوە • لە لاپەڕە ـ ١٤٠ ی کتێبەکەیدا نووسیویەتیو ئەمەش پوختەی بۆچوونیەتی[٤٨] :

« بە دوای کاری تێپەڕدا ، بریتیە لە « یە » وەك ـ من ئەو گرتیە ـ ، بە دوای تێنەپەڕدا ئەگەر کۆتایی بە بزوێن بوو ، نیشانەکە ـ ە ـ یە ، وەك [ ئەز چومە ] دەنا بریتیە لە ( یە ) وەك ( ئەو چوویە ) » •

(٤٨) ئاوا دەستورا زمانێ کوردی چاپی بەغدا ، ساڵی ١٩٦١ .
بەپێویستم نەزانی بە دەقە ئاخاوتنەکەی خۆی نووسینەکەی ڕاگوێزی ئێرەبکەم .
ئەو کتێبە کارێکی سەرەتایەو لەسەر شێوازی ڕێزمانی عەرەبی کەرەسەکەی دابەشکردوەو پتر پشتی بە کۆکردنەوە ـ نەك لێکۆڵینەوە ـ بەستوە .

**بەشـوێن‌کەوتن‌و ئەنجـام :**

١ ـ کە رابوردووی نزیك بە « دووربۆری » داوەتـە قەڵـەم ، لـە دابەش‌کردنە رەوانەکە لای‌داوە ؛ ئەم جۆرەکارە ، لە زەمانی دووردا روونادا ، تەنانەت ئەوەنـدە نزیکە هـەنـدێ زمـانـەوان زەینیـان لێ‌ترازاوەو بە ئاوەڵنـاوی کـاراو بەرکـارو کاری ئێسـتایـان داوەتەدەست ..!!

٢ ـ تاودانی جووتە فۆرم‌و روخساری « یە » و « ە » بۆ تاقەنیشانەیەکی یەك ئەرك‌و لە شێوە زمانێکدا ، دەمان‌باتەوە بۆ مەسـەلە گۆرینی لەمەوبەر : کە هەندێ بە تاوی بڕگەکاری چەندان روخسـاره مۆرفێمیان لێ سازاندبوو . ئەو دیمەن‌کاریەش پەیوەندی بە گۆڕانی دەنگاوازەوە هەیە .

وەك لە مەولا دەری‌دەخەم ، ئەو نیشانەیە ـ لە کرمانجیی سەروودا ـ بە فۆرمی « یە » خۆی‌سـاغ دەکـاتـەوە ، هەروەك لە کرمانجیی خوارووداا بە چەند فۆرم‌و روخسارێك ، بەپێی بەشـە دیالێکت ، دەردەکەوێ .

٣ ـ تەنها بەراوردەکەی لە کاری « چوو » دا کردوە ، ئـەمـەش نابێتـە بەرەنجامی لە ساغ‌کردنەوەدا .

٤ ـ لە ـ ل ١٨٠ ، ١٨١ ـ دا ، نیشانەی نزیکی لە کرمانجیی خوارووداا ، لەگەڵ مۆرفێمی دووبارەو پاشکۆئامرازدا ، کردوونەوە بەیەك .



# سەرەنجامی قۆناغی یەکەم

* لەو بەشە هەڵسەنگاندنەدا بیست‌و یەك نووسینێکی زمانە وان‌و زمان دۆستەکانم نواندن‌و بەشوێن زنجیرەیەکیان کەوتم کە لە قاڵبی بڕیارو لێکۆڵینەوەدابوون •

سەرجەمیان ڕێگەی بەرەنجامیو بەراوردیان نەگرتبوو ، جا ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە بابەتەکەیان دابێ یان نە دابێ ، ئەگەرچی ڕەخنەگرانە تەوەژمم خستەسەریان ••• بەلام کۆگایەکن ••• بەڵێدانەوەیەکی دی سەرچاوەن بۆ مەبەستی بەراوردو تۆژینەوە •

بشمانەوێ نووسین بێخەوش بێ ، خۆشاردنەوەیە لە ڕاستی •

کەواتە کارەکە لە کوێوە شێواوە ؟ •• ئەو نووسینانەی کە زۆرینەیان لە جغزی مۆرفێمی دووبارەو تا ڕاددەیەکیش دەربارەی نیشانەی ڕابوردووی نزیك‌بوون ، لە ئاڵۆزکاێکی سێ‌سەرەوە ، شێوە دەمەقاڵییەکی نەپساوەیان خولقاند ؛ چونکە پاشگرێك‌و نیشانەیەك‌و پاشکۆ ئامرازێك ـ دوورو نزیك‌و هاوڕوخسار ـ دەستملان بووبوون ؛ هەریەکەشیان لە بەرەیەکی تایبەتیەو فرە جیاوازە •

بەبێ لێکۆڵینەوەو بەراوردێکی چڕ ـ لەمیانی هەرسێکیاندا ـ کارەکە ناچڵ دەبێ‌و ناگەینە ئەنجام ؛ ئەمەش پشکنینێکی دەوێ لە شێوەکانی زماندا ، بەپێی ناوچە کوردستانیەکان‌و لە هەندێ لاوە سەرە تاتکێ لە زمانی فارسیدا •

لە تێکڕای ئەو نووسینانەدا ـ وەك پێویست ـ مەبەست نەهاتەدی‌و لایەك لە نهێنیە زمانیەکان نەکرایەوە ؛ بێجگە لە هەندێ بۆچوونی تایبەتی ، بەگشتی لە یەك سووڕگەدا بوون ، ئەوەی‌کە پەیوەندی بە مۆرفێمی دووبارەوە هەبوو ؛ هێنان‌و بردنی ئەم قسەیە بوو : « ڤە / ی کرمانجیی

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ | ١٦ | ١٧ | ١٨ | ١٩ | ٢٠ | ٢١ | ٢٢ | ٢٣ | ٢٤ | ٢٥ | ٢٦ | ٢٧ | ٢٨ | ٢٩ | ٣٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| + | [illegible] دووڤاران | کۆماغی سەرەڕوو (+) | کۆماغی خوارەڕوو (+) | باشتکەری دوو ڕوو بازە (٠) | کۆماغی سەرەڕوو (+) | کۆماغی خوارەڕوو (+) | نیشانەی لەوردووی زبانا | کۆماغی سەرەڕوو (+) | کۆماغی خوارەڕوو (+) | [illegible] | کۆماغی سەرەڕوو (+) | کۆماغی خوارەڕوو (+) | [illegible] (+) | بە گۆماغەوە (+) | [illegible] ـ یـ (+) | [illegible] ـ ت (+) | [illegible] ـ ر (+) | [illegible] ـ س (+) | [illegible] ـ ن (+) | [illegible] (+) | [illegible] (+) | [illegible] (+) | ـ٥ـ [illegible] (+) | [illegible] (+) | [illegible] (+) | [illegible] (+) | [illegible] | [illegible] | [illegible] (+) |
| ١ | قه | + | - | وه | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | + | - | + | - | - | - | - | - |
| ٢ | - | - | - | ەوە | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | + | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ٣ | - | - | - | ەوە ؟ | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | + | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ٤ | - | - | - | وه | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | + | + | - | + | - | - | - | - | - |
| ٥ | قه | + | وه | ەوە | + | + | - | - | - | - | - | - | + | - | + | + | - | - | - | + | - | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ٦ | قه | + | - | ەوە | - | + | وه | - | - | + | - | - | + | - | + | - | - | - | - | - | + | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ٧ | - | - | - | وه / ڕوو / [illegible] | = = | + + + + | وه ؟ | - | + | وه / ەوە | - - | + + | + + | - - | - - | - - | - - | - - | - | - - | + + | + + | - - | - - | - - | - - | - - | - - | - - |
| ٨ | - | - | - | وه | - | + | وه | - | + | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | - | + | [illegible] | - | - | - | - | - | - |
| ٩ | قه | + | - | وه / ەوە | - - | + + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | + | + | - | + | - | - | - | - | - |
| ١٠ | قه | + | - | وه / ەوە | - - | + + | - | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | ؟ | - | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ١١ | قه | + | - | وه | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | + | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٢ | قه | + | - | ەوە | - | + | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٣ | قه | + | - | ەوە | - | + | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٤ | قه | + | - | ەوە | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٥ | وه / قه | - / + | + / - | ەوە / قەه | - / + | + / - | ه | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - / + | - | - | - | - | - | - |
| ١٦ | - | - | - | وه / ەوە | - / - | + / + | گه | - | + | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٧ | قه | + | - | وه / ەوە | قەه | + / + | یه / ه | + / + | - / - | قه / وه | + / + | - / + | + / + | - | - | - | - | - | - | - | - | + / + | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٨ | قه | + | وه | ەوە / وه | - / + | + / - | - | - | - | - | - | - | + / - | - | - | - | - | - | - | + | - | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٩ | - | - | - | - | - | - | ووه / و | - | + | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٢٠ | قه | + | + | ەوە / ەوای | - / - | + / + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | + | + | - | - | - | - | - | - | - |
| ٢١ | قه | + | - | قه / وه | + | + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | + | - | - | - | باز | - | - | - |

خشتەی ژمارە -١-

سەروو ، ـ ەوە / وە ـ ی » کرمانجیی خواروو ؛ تەنها بە دوای کـارو چاوگدا .. ئەرکەکانیشی بەیەکدا چوو و ناچلبوون .

نیشانەی رابوردووی نزیکیش تەنها لە ڕێژگەی کەسی سێیەمی تاکدا لەم نووسینو لەو نووسیندا دووبارەکراوەتەوە ، سەرجەمی نووسینەکان ، خەرمانێکی سوورنەکراون ... بێتو هەرکەسەو ڕای یەکێکیان پەسندبکاو لەروانگەی دەستوورەوە چاوی تێببڕێ چەند قوتابخانەیەك لـە ڕێزمانی کوردیدا دروستدەبێ . ئەوسا دەستوورەکان بـە جیهانێکی دەمەقالێدا کێشدەکرێنو لە ئەرکە سەرەکیەکانیان دەردەچنو ناگەینەئەو ئەنجامەی کە بمانەوێ زمانی نووسین ، بەدەستووری چەسپاو ، دابینبکەین .

بۆ بەلگەی سەلماندن ، وەك چەند هێلێکی بەیانی خشـــتەی ژمـارە یەکەمم خستە بەرچاو ، بگرە لە سایەی ئەو مۆرفیمە هـاو روخسارانەوە ، زۆر شتی لاوەکیی نەگونجاو سەری پێوەنا ، ناچار بووم بژارەیانبکەمو توشی لادانو پچڕانی نێوەرۆکی باسەکە ببم .

ئەو بەلێنەش لە من ناوەشێتەوە کە سەرومڕ کاربەئەنجام دەگەیەنم ؛ ئیشەکەم سۆراخێکەو لە زمانێکی بێنازدا ، ئەگەر لەو ســـەریشـــەوە ، سەرفرازنەبم خۆ لەم سەرەوە ، تا ڕاددەیەك ڕێگاکە ئاسان دەکـــەمو لـە هەندێ لایەنی ناهەموار هەلی دەپەردێوم کە زماندۆستانی نەتەوەکـەمـان بەرنامانە تەکانێکی زانستانە تر بدەنو لە نیشـــانپێکاندا قریوەیەکی بۆ بکـەن .

« ئەســــــــــی نەفەســـــــــت دێتو دەچێ
ئەی مەستی ریازەتهەلە ! هوشـــیاری جلەوبە »
ـ نالی ـ

# — ١ —

## ڕۆژنــەیــەك

دیالێکتەکانی

✱ دابەش‌کردنی شێوەکانی زمانی‌کوردی[٤٩] ..

| شێوەسەرەکیەکان | | دەستەشێوەکان |
| --- | --- | --- |
| ١ ـ کرمانجیی سەروو | ⟵ | بایەزیدی ، هەکاری ، بۆتانی ، شەمدینی ، بادینانی . |
| ٢ ـ کرمانجیی خواروو « نێوەڕاست » | ⟵ | موکری ، سۆرانی ، بابانی ، ئەردەڵانی . |
| ٣ ـ گۆرانی | ⟵ | گۆرانی ئەسڵی ، هەورامی ، باجەڵانی ، زازایی . |

---

(٤٩) بۆ ئەم دابەش‌کردنە چەند سەرچاوەیەك دەکەمە دەستەبەر :ـ

١ ـ ئەسڵی پیتە قالبی « ئە »ی شێوەی سلێمانی / . گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد ، ژ ١ ـ ب ١ ـ ل ٩ ـ ١٩٧٣ . تۆفیق وەهبی .

٢ ـ التوزیع الجغرافي للهجات اللغة الکردیة / . هەمان سەرچاوە ـ ژ ٣ ـ ب ٢ . ل ٦٢٣ . فوئاد حەمە خورشید . (اللغة الکردية الد

٣ ـ کوردو کوردستان / . محەمەد ئەمین زەکی .

٤ ـ کوردستان‌و کورد / . د . قاسملو ـ ١٣٥٢ .

٥ ـ زمانە ئەدەبیەکەمان / . دەست‌نووسی ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی .

٤ ـ لوڕی ••• ⟵ فەیلی ، مامەسانی ، گوەگلوی ، بەختیاری ، لەك ، کەلوڕی •

کاریگەربوونیان بە پێی هەڵکەوتی جوغرافی :

أ ـ بەچاو تەوژمی دەرەکیەوە :ـ

١ ـ کرمانجیی سەروو ، بەتاوی تورکی ، ئەرمەنی ، لقی ڕۆژئاوای = ( بادینی ) بە عەرەبی •

٢ ـ لوڕی : بەتاوی فارسی لە ڕۆژهەڵاتو خوارووی ڕۆژهەڵاتیەوە •

٣ ـ لقەکانی گۆران : زوربەیان پەرشوبڵاون • لە گەرمیانەوە ـ بە بازدانێکەوە ـ بۆ زازا •

بەتایبەتی لە ناوچەی خانەقیو کفریو ناوچەی کرندو زەهاودا ـ بگرین گەرمیان ، هێلی بەرگریی سەرێنی ( عهد )ی دەسەڵاتی تورکان لە تەلکووچەکەوە تا ڕۆژهەڵاتی ئەو زەمینەیە ، بەتەوژم کاریتێداکردوە •

٤ ـ لقە هەورامیەکە ، وەك دەستە شێوەکانیدی گۆران ، پەرش نەبوو ، لە قۆناغێکی ئەدەبیدا تەرزیهاویشت ، ستراتیژیی شوێنەکە ڕەسەنێتیەکەی پاراست ، بە خواستی مێژوو خۆیکرد بە سەرگەردانی شێوەگەشە سەندوەکەی تازە خەیمەگای شارەزوور •

٥ ـ هەرێمی تێوەندیی لە جەرگەی کوردستاندا :ـ

وەك دەردەکەوێ پاکتر خۆی پاراستوە ، بەچاو هەرێمەکانی دیکەوە، بەم دالدانە :ـ

١ ـ خۆکردی زەمینەکەی کەنار وەستاوە لە تەوژمی چوارلانەی قەراغ ؛ ڕاستەوخۆ تەوژمە دەرکیەکان ئەو کارەیان تێنەکردوە ، لەباتی

ئەوەی کـە بچرووســێ ، خۆی بــە دەوروبــەرێکی خانــەزای خۆی تەسەل کردوە[٥٠] •

ب ـ کارتێکرانی نێوخۆیانە :

ئاشکرایە تاقە زمانی نەتەوەیەك ، بەو شێوە دابڕینە ، شـــێوەو دەستەشێوەکانی دوورونزیك دەوەستن •••• لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان لـە یەکدی هەڵدەخزێننەوە •

بە نموونە کرمانجیی خواروو ـ مامۆستا تۆفیق وەهبی بە کرمانجیی ناوەڕاستی ناودەبا ـ دەیکاتەوە بە چوار شێوە :

١ ـ شێوەی شارباژێر ـ کە زمانی بابانەکان بووە ـ دەبێ زمانێك بووبێ سەر بە شێوەی ـ پشدەر ـ •

٢ ـ شێوەکەی پشدەر کاری لە شێوەی موکری کردوە •

٣ ـ شێوەی ( سۆران ) = هەولێر ، کاری لە هی پشدەر کردوە •

بە پێی بۆچوونی مامۆستا تۆفیق وەهبی سۆرانیو پشدەری ، دەبنـە بنکەی شارباژێڕی و موکری • بەڵام لە ئەنجامی بەراوردەوە هاتومەتەسەر ئەو باوەڕە کە بڵێم :

« ١ ـ دەستە شێوەی سلێمانی لەهجەیەکی سەربەخۆ نیـە ، بەڵــکو شێوە گەشەسەندویەکی موکریە « لهجة متطورة » •

---

(٥٠) لاری لەوەدا نیە کە هەرێمی نێوەڕاستیش تا رادەیەك ، زمانی فارسی کاری تێ کردوە ، پتر بەهۆی لێکدی نزیك بوونیان ، بمانەوێ و نەمانەوێ لەیەکدی قۆزینەوەدا بە توانان . دواتر لە ســـەرێنیی «عهد» بابانەکاندا ، فارسی نووسین باوبووە . دەبێ لەوەش بەئاگابین کە نابێ یەكســـەر مۆرکی فارسی لەو بێژەو دەنگاوازانە بدەین ، هاوبەشی هەردوولان . ئەگەر خۆبەکەم زانینو بێدەســەڵاتی یەخەمـــان بەربدەن ، کوردی ئافەریدەیەکی پاشینەی فارسی نیە ، هەرچەندەش زەبوون خۆراکی زاڵــە .

٢ ـ وەك ئاخاوتنی ( سنە ) لە ئەردەلاندا ، ئەویش گەشەسەندوە ، پاش گواستنەوەی میرە ئەردەلانیەکان لە شارەزوورەوە بۆ سنەی ئێستا •

وەك لەمەولا دەردەکەوێ لقی بادینیو سۆرانی ، باش باش بەیەکدی کاریگەر بوون •

گوماندەبرێ کە لە نێرەوی باسەکە لامدابي ؟ بەمتمانەوە دەڵێم :ـ

« بەشوێنکەوتنی ئەو مۆرفێمانە لەم هەوارەوە بۆ ئەو هەوار ، بەبێ دەستەبەریی ئەو لایەنە مێژوویە ، کارێکی ناهەموارانەیە •

لەبەرئەوەیکە سۆراخکردنی جووتە مۆرفێمەکەو پاشکۆئامرازە هاوروخسارەکەیان ، ناوچە بە ناوچەو هەرێم بە هەرێم ، وردکردنەوەیان دەوێ ، لە سوورگەی ئەو نووسینانەی لێیانمکۆڵیەوە ـ دەربازدەبم ••• کارەکە بەوە مەیسەر نابێ کە بنووسم لە کرمانجیی سەرووداو وەهانو لە خوارووشدا ئاوان ••• !!

وام بۆ دەرەخسێ کە پتر ، هەرێم بگرە گوندیشیان بۆ دەستنیشانبکەم •

دوای تێڕوانین لە رۆژنەی شێوەکاندا ، بۆم هەیە ، هەرێمی نێوەند ( مەڵبەندی بابانەکان ) بکەمە خانەزای مۆرفێمەکان •• دواتر بەشوێن کەوتنێك لەدەنگسازیداو تاوی ئاووهەوا ( مناخ ) لەسەر سازگەی گۆکردنو راهاتنی لچولێو ، ئەگەر بۆ باری سەرنجیش بێ ، خۆمی لەقەرەدەدەم •

چونکە زمانی ئەدەبیمان لەبارەی گەردانو رستەسازیەوە ، کامڵەو خۆی ساخکردوەتەوە ، بەمەرجێك نەبین بە کۆسپ لە رێڕەوە مێژوویەکەیدا ، ڕەتبڵاویتێدا پەیدا نابێ •

پوختەی قسە ئەوەیە کە تا ئێستا ئەو مۆرفێمانە ( بێجگە لـە چەنـد نموونەیەکی ساکار ) هیچ هێنیەکی زمانیان لەپاڵدا نەورووژاوە بەو گشتە نووسینانەی کە لێم کۆڵینەوە ، نموونەیەکی شیکراوەم نەکەوتە بەرچاو کـە مۆرفێمەکان جووتەی تێداببەستن •



## — ٢ —

[ مۆرفێمی دووبارە لە ئاخاوتنی سـلێمانیدا ]

* أ ـ کە بەدوای دەنگدارەوەبێ •

١ ـ لەگەڵ کاردا :

« گـەزیــزە پیربوون لەتێــو نزاران
هـەر ئێمە ماینەوە ، لە کۆنەهەواران »
« پەندێکی پێشینان »

« کەشایەد بێتەوە ، بۆ سەیری شینی ئەم سـیابەختە بەمەرگی ـ مەحوی ـ ئەی نەی ناڵەبێ ، وەی دەف خرۆشێکە » •

٢ ـ لە گەڵ وشەی لێکدراودا :

( پڕکردن ⟵ پڕکردنەوە ) •

٣ ـ لەگەڵ ناوو ئاوەڵناودا :

( لاساپانکەرەوە ، یان لاسابانگکەرەوە ) •

ــ رەگە ئاوخۆرەوە •

ــ تاڵەوەکەرەی خۆشەوەکەرە • ( ـ تاڵ کەرەوەی خۆش کەرەوە )

— ئاوەڕوونکەرەوە ، یان ئاوەڕوونکە[٥١] •

٤ ـ لەگەڵ ئاوەڵکاردا :

— دیســـان ⟵ دیسانەوە •

— هەمیسان ⟵ هەمیسانەوە •

٥ ـ لەگەڵ کارداو بەزێدەیەکی تایبەتیەوە :

— هاتــەوە ⟵ هاتەوانێ •

**ڕاڤــەو توێژینەوە :**

١ ـ فۆرمی مۆرفێمەکەو شوێن لکانی :

لەســـــەرتاپای ئــەو نموونانەدا ، بــە بیچمی « ەوە » خۆیداوە بەدەستەوە ، بەپێی بەرەنجامیو ئیستیقرا لە ئاخاوتنی ناوچەکـــەداو لـــە ئەدەبیاتی نووسراوەیدا ، وەك پاشگر خۆی داڕشتوە •

لە بەراوردی لەمەولا دەردەکەوێ ، ئەوپەڕی پێزو تەوژمی هەیە لەم ناوچەیەدا بەچاو هەرێمە کوردستانیەکانی دیکەوە • بە پێشــگرو لەگــەڵ وشەی دارێژراوو لێكدراودا ، دیاردەی ئێرەنیــە ؛ ئەمــەش لــە دواینەی بەحسەکەمدا دەردەکەوێ کە پاشگرایەتیەکەی رەســـــەنترە • چونکە زاڵترین ئەرکی ئەو مۆرفێمە زەق کردنەوەی ڕوودانیکارە • لە زۆر خێڵە وشەدا وەك پاشـــــگری [ انــدن ] دەوری شەحن[٥٢] دەبینێ ، بگــرە ڕوودانەکە وێنەدارتر پیشاندەدا • ( پـــــــحـ )

---

(٥١) ناوی توخمەگیانداریکی ، رەشی بریقەداری بەرســك سوورە . وەك کێچەو گەورەترە ، بەســـر گۆمیلکانەوە بەکۆمەڵ دەســـــووڕێنەوە ، تالێلاوەکە دەڕەوێننەوە .

(٥٢) ئەرکی شـــەحنکردنەوە بـــە پاشگر ، زادەی بیری خۆمە . ئــەو مەبەســـتەشم بە ئەو زاراوەیە نەبێ بۆم دەرنـابڕدرێ ، زاراوەی ـ بڕکردنەوەو هێزپێدان ، لێرەدا جێگەی ناگرنەوە .

* ئدیۆمی [ تاڵەوەکەرەی خۆشەوەکەرە ] بەهەمان داڕشـــتن ، سەربە کوێیە ؟

بەو هەڵچەرخانەوەیەوە لە ئاخاوتنی سلێمانیدا ، بەگوڕە • ئـەگـەر بە ( تێوگر ) دابنرێ ، هەڵەیەو چاوپۆشیی لێناکرێ ؛ چونکە پەیوەندی بە بەشی پەیوەستیی نا پەیـــدایی ( جزء ترکیبي غیر حدثي ) یەوە نیـە • پاش یان پێشی ئەو وشـــانە دەگرێ کە بۆ روودانی کـار داڕژاون ••• ئەمەش تایبەتێکی گەوهەریە لە هەڵکەوتی ئەو مۆرفێمەدا ••

لە هەمان رێژگەدا[٥٣] ناتوانین پێی بڵێین پێشگر ؛ چونکە بە تەواوی هەڵنەچەرخاوەتەوە •

وای بۆ دەچم : کە تەنها ( وە ) هەڵچەرخاوەتەوە ، بێتو لـە قـاڵبی ( تاڵەوەکەر ••• ) دا بهـاتـایـە ، دەبوو بە پێشـــــــگر ناوی‌بیـەین • لە دەستەشێوەی شـــــــارباژێڕو موکریدا ، دەگوترێ : ( تاڵکەرەوەی خۆشکەرەوە ) دەشبوو ئەم کارە بە پێچەوانەوە بێ ، لێرەدا وردکردنەوەیەکی دەوێ ••

مەڵبەندەکەی شارەزوور ، بەر لە دابەزینی دەســـتە شـــێوەکەی شارباژێڕ ، لە قەڵاچوالانەوە ، دەســـەڵاتگای ئەردەڵانیـە کـان بووە ، جێماوێکی ئاخاوتنی ئەوانە ، کە بە زوڵاڵی ، لە وشــــەی لێکدراودا ، مۆرفێمەکە بە تەواوی دەکەنەوە بە پێشگر • شێوە ئاخاوتنەکەی شارباژێڕ

---

(٥٣) لیژنەی رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ئەو زاراوەیان چەسپاندوە ، من – رێژگە – پێشنیاز دەکەم :

ا – رێژە – لە بیرکاریدا بۆ ( نسبة ) جێگیربووە ، جا ، راســـتبێ یان‌نا ، لەسەری ناڕۆم •

ب – صیغة = مصوغ ، قالب – کوردیەکەی بەم گەردانەیە :

رژن = رێژتن = رێختن – تن + گە = ناوەڵکاری «رێژگە» .

کوتومت قاڵبەکەی وەرنەگرتوە و بزوێنە بەراییەکەی بەجێهێشـــتوە •
ئەوسا دەبێ بزوێنی دوای ( تاڵ •••• ) بۆ پاراستن بێ ، ئەگـــەر بەشی بنجیی ( ەوە )ی هەڵچەرخاوەبێ دەبێ بزوێنی دوای ( کەرە ••• نیشانەی ئامێرەناو = اسم آلة ) بێ ، جێگەکەش ئـەوە هەڵنـاگرێ ؛ بۆ هەمـــان مەبەست نموونەی زەقتر : ( ئاوە خۆرە ، جامە ئاوە خۆرە ) لە برێ ناوچەی کوردســـتاندا ، بەرانبەر بـە [ آبخورە ] لـە فارسیو ئوردوودا ، لـەم نموونەیەدا ، بزوێنی دوایی نیشانەی ئامێرەناوە ، بزوێنی دوای ( ئاو ) بـە نێوبەست = ئینترفیکس ـ ی دا دەنێم ، دەنا دەبێتە دەستە رستە = شـبە جملەو لەم سورگەیەشدا نەماوە • لەوە شۆڕاوە کە پێیبگوترێ ئامرازی پەیوەندی یان بەلێدانەوەی هەندێ زمانەوان : نیشانەی ئیزافە ، یان وەك ( دەستە چیلە ، کەرەگۆشە ••• هتد ) •

٢ ـ لە نموونەی « بێتەوە » دا و لە باری دەنگســـازیەوە ، مۆرفێمەکـە لکاوە بە دەنگداری / ت / وە[٥٤] •

---

(٥٤) دەنگی / ت / لە وێنەی ( دەچێ ، دەچێت ، دەکا ، دەکات ) دا ، بە بەشـــە راناوی کەسی سێیەم نازانم ، راناوی کارا کـــە بۆ دۆخی ئیسنادە ، نابێ تێبچێ و بڕبڕەی کارەکەیە .

بەسەرانـــەری گەردان راناوی ( ێ ) و ( ا ) ی « دەچێ ، دەکا » دەوردەبێتەوە ، دەنگی / ت / لە « دەچێت ، دەکات » جێگای لەقەو تێدەچێو جارجارەش دەگوترێ ، بە سەرنجدانی زمانی قســـەو ئەدەبیاتی کۆنو تازە ، ئەوەمـــان بۆ دەردەکـــەوێ . کە لەگـــەڵ مۆرفێمەکەشدا ، خۆی رادەدا ، وەك ( دەبێتەوە ، دەکاتەوە ) ئـەوە باری ناچاریەو نێوبڕە بۆ ترازاندنی جووتە بزوێنی ( ێ + ە ، ا + ە ) نایشارمەوە لەمێژە لێی بەشكبووم ، لەم بەحسەمداو بە سەرنجدانی بۆ چوونێکی مامۆســـتا مەســـعوود محەمەد لێی دڵنیابووم . بـۆ « وردبوونەوە لە چەند باسێکی رێزمانی کوردی». ل ١٤٨ / ١٩٧٤ .

٣ ـ وشەی « لاساپانکەرەوە » :

ئەوەندەی‌دی جوولآنو ســـەمەرەی ئەو دەعبادزێوە وێنەداردەبێ ؛ ئەویش لەسایەی مۆرفێمی « ەوە » وە •••

لە دووسەرەوە تووشی ڕێسەدەبم : یەکەم ـ ئەو مارِزە ئەفسانەیەکی بەخۆیەوە ناوە •

دوەم ـ تائێستا نەم‌دیوە زمانەوانێك ، باسی ئەو پاشگرە بکا ، کە بە ناوەوە دەلکێ‌و تایبەتی پاشگرەکە ـ وەك تەلســـمێك لە زمانەکەماندا ـ وەدەردەخا !!

أ ـ لاساپانکەرەوە : بە پێی ئاخـاوتنی ناوچەی ئـالانو هـەنـدێ دێهاتی بەشی بانە •• نـاوی قۆڕیەکی دزێوە • بزنمژەنیـە • لـــە خێلی قومقومەو شەوگەردە • بیچمی گەورەیە •• شین باوێکی چلکنی لۆچاوی گەڕە • بەسەر تاشەبەردو زەندۆلەوە ملەقوتێ دەکا • لە هەندێ شـــوێن ( سەر مازەلە ) و لە هەندێ هەرێم ( خمەگەڕە ) و لە ناوچەی شـــــوان ( پیس‌پیسۆك ) و لە هەوراماندا ـ پێی‌دەلێن : « بەلبەلەتێرە » لە هەندێ کەسی ناوچەی سرۆچکم بیستوە ، کە پێی دەلێن : [ لاسابانگکەرەوە ] •

ئەم ناوە دەورێکی فیلۆلۆژیم پێ‌دەکاتەوە لەوانەیە زمان دۆســـتان گەمەیان بەم قسانەم بێ ••• بەلآم باش ، باش دەرسم‌دادەداو خاســـیەتی مۆرفێمەکەم بۆ دەنوێنێ •

ب ـ ئەم قۆڕیە کە لە شت دەسلەمێتەوە ، لەســـەر تاشەبەرد خۆی مەلآس‌دەداو مل‌کووز دەکاو بەچەشنی سوجدەبەر ، بەخێسەوە ســـەری هەل‌دەبڕێ‌و دای دەنەوێنێ •• خەلکی‌زۆیان دەدزێ ؛ گوایە وەك شەیتان گالتە بە نوێژکەران دەکا ••• یان لەسەر ئەشکەوتی « ثور » بە ملەقوتێ کافرانی بانگ‌کردون : ( ئەوەتا خەنیمەکەتان لە ئێرەدایە ) کەواتە وشەی « لاسا » ئەو مەبەستە دەگەیەنێ •

وشەی ( ... پان .. ) هەرخۆیەتی یان گۆڕاوە ؟ ..

من وای بۆدەچم کـــە ( ... پانکەرەوە ) لە ( بانگکەرەوە ) نەبێ ، چونکە بۆ ئەوەی کە چاوێکی لە دوژمنەکەی بێ ، بە خێســـــەوە قیتەقیت دەکاو سەری مەلاس دەداتەوە .

جگە لەوەش بزووتنەوەکەی ، تەمســـــیلی بانگ نیە ، بێتو ئەوە بێ مۆرفێمەکە دەوری نابێ و دەبێژرا : « لاسابانگکەرە » وەك (هێیی هێکەرە) کە ناوی باڵندەیەکەو لەتێو نزاردا شوان هەڵخەڵەتێنە . مەبەستم ئەوەیـە کە ئەوسا پێویستی بە ئەو مۆرفێمە نەدەبوو .

کەواتە وشەکە لە ئەسڵدا [ لاسەرپانکەرەوە ] یە شێوە هەورامیەکەشی دالدەم دەدا :

[ بەلبەلە ] = بەلەبەلە = قیتەقیت = رەپ ، رەپ کردن . بزنەبەل = بزنەقیت . یان ـ ( بەلـەبـەلـەی منـداڵ بە چووکی ... بەدەم نـەرمـە گۆرانییەکەوە : ( بەلەبەلە شوانە ـ خێرا خێرا .... رەپ کردنی ... ) .

تێرە = خێسە .

ئنجا بەراوردێك لە نێوان ( لاسەرپانکردن ) و « لاسا پانکەرەوە = لاسەر پانکەرەوە » دا ...

رووداني كار لەیەكەمیاندا ، نە شێنەییەو . نـە دووبارەیە .. بـەلاَم لەدوەمیاندا ، بەردەوامیو نواندن ئاشـــــکرایە ، لە کارتێکرانی هەردوو رووداوەکەدا شــــکڵو بیچمێکی وێنەگەرانە دروســـــــت دەبێ ... دەتوانم بلێم : ئەو پاشگرە ئەرکێکی دیکەشی هەیە کە نواندنە ، ئەو جۆرە

ئەرکە ناسکانەش لە وشەی لێکدراوی کوردی دەوەشێنەوە[55] ئەگـەر وشەی ( لاسا پانکەرەوە ) دزێویش بێ کلیلە گەنجینەیەکە بـۆ مەبەسـتی زمانەوانی •

٤ ـ گەردانی ئاوەڵکاری « دیسان » :

| | |
|---|---|
| دیســان | ـــ دیسانەوە |
| هەمــدیس | ـــ هەمدیسانەوە |
| هەمیســان | ـــ هەمیسانەوە |
| دیسانەکە | ـــ دیسانەکەوە |
| دیسانەوە | ـــ دیسانەوانێ |
| دیسانەکەوە | ـــ دیسانەکەوانێ •••••• |
| هەمــدیس | ـــ هەمدیسەوە •••• |

---

وای بۆ دەچم کە ئەو قاڵبانە دەچنەوە سـەر یەکبنکەو بریتیـە لە « دیس » ئەم وشەیەش پەهلەوی نەژادەو فارسی‌نیە ، لە بەراییدا بە واتای مانەند = نظیر و وێچوو ، بەکارهێنراوە •

---

(55) شکۆپێدانی وشەی لێکدراوی کوردی بەم لێدانەوەیـەی خوارەوە ، زادەی بیری خۆمە :

« هەندێ وشەیلێکدراوی کوردی بـە چەشنی تـاقـە دینەمۆیەکن‌و بەچەند دوگمەیەکو بۆ چەندان ئەرك دەکەوێتە بزووتنەوەی هەمەلا ، نەك کۆمەڵێك وشە وەك کۆمەڵێك دینەمۆ ، هەریەکـە لـە یـەك لابزووتنەوە پتر تواناى نەبێ .. ئەم سەمەرەیە دیاردەی ئـەو خێڵە زمانانە نیە کە وشەی لێکدراویان تێدا نامۆیە » .

ئەو لێدانەوەیەم نێوباخەڵی کورتە باسـێکەو لە سـاڵی ١٩٧٢ ، ١٩٧٣ ـ دا ، بە سەرناوی ( پیادەگەشتێك لە هونەری وەرگێڕاندا ) ناردم بۆ گۆڤاری کۆڕی زانیاری ...... لێرەدا دەوەستم‌و دەڵێم : ئەو پەرەگرافەی من لەوانەیە پەڕیبێتە برێ نووسینەوە !!

ئەوەندەی‌کە لە زمانی کوردیدا برەوی سەندوە لە فارسیدا شکۆفەی نەکردوە .. توانای ئەم وشەیەو زانەوەی لە کوردیدا ، تۆکمە بەڵگەیەکی مێژووی زمانمان دەداتێ کـە زمـانی کوردی‌و پەهلەوی هاوهەوارگـــەو دەستەملاتترن‌و لە کوردیەکەدا باشتر خۆی پاراستوە ، لە مەولاش هەر لە خودی مۆرفێمەکەوە [ ەوە ] بەڵگەیەکی زەقترمان دێتەدەست .

لەبڕێ سەرچاوەی فارسیدا[٥٦] ئەمەی خوارەوە نووسراوە :

« خایەدیس ــ دیس : مانند ، شبیه ، بمعنی مملکةو ناحیه نیز استعمال میشود ، و اصل آن پهلویست ، نه پارسی .

**مثـال :** مانەند : و نحور : شبیه ،

« چه قـدر آورد بنـدهٔ حور ــ دیس ــ[٥٧]
کـــه زیـــر قبـا دارد انـــدام پیس »

« سـعدی »

شبدیز = شبدیس ( اسپ خسرو ) شبرنگ .

---

(٥٦) أ ــ دستور جامع زبـان فارسی ، تألیف اسـتاد ( عبدالرحیم همایونفروخ ) هفت جلـد در یک مجلـد ، چاپ دوم ، تهران ــ ١٣٢٤ ص٣٦٦ .
ب ــ دیس ، دیسه ، دیز : اسم / شبیه ، مانـند ، مثل خایەدیس ، طاقدیس ، شبدیس ...
فرهنگ عمید و برهان قاطع . / ئەمان بەکورتی هەر ئەوەندەیـان لێ‌گوتوە .

(٥٧) هومایونفروخ راڤەی ( خایەدیس ) دەکاو دەڵێ :ــ
« کلاه شیطان ، کلاه دیو ، چون سـم اسـت . نوع خوردن آنرا ــ قارچك ــ گویا ــ قارچك ــ ترکی است » .
* لە زۆر شوێنی کوردستاندا ، بەرانبەر بە ( قارچك ) وشـەی ( کارگ ) بەکاردەهێنن‌و لە مەڵبەندی گۆراندا ( قارچك ) بـاوەو پەسندنیە .
بەرانبەر بە ــ خایەدیس ــ ئەم ناوانە لەکاردان : ( کارگە گولە ،
←

**بەرەو مەبەست :**

لەمەوبەر بە نیگایەکەوە دەرم‌بڕی کە مۆرفێمی دووبارە لە سووڕگەی کارو ڕووداودا دەورێکی بە تەوژمی هەیە ، هەر وشەیەك بۆنی ڕوودان‌و پەیدایی ( حدث ) لێ‌نەیە یان بەرەو پەیدایی نەی‌جوولێنێ ، لەگەڵیدا باشارناکا .

ئاوەڵکاری « دیسان » لە واتا بەراییەکەی دوورکەوتوەتەوە ، یان بڵێین پتر گەشەی کردوە ، کورد کە بەکاری دەهێنێ بۆ مەبەستی دووبارەیەو ئەندێشە لە ڕەگە واتاکەی ناکاتەوە کە وێچوون‌و مانەندە . کە لەگەڵ مۆرفێمەکەدا بەکاردەبرێ ، تەنها بۆ تابینا = تەءکیدە ، مەسەلەی تابینا لە زمانداو بۆ دۆخی ڕوودان‌و سەلماندن دیاردەیەکی ئاساییە ، بگرە بۆ باری سەلماندن‌و دڵنیایی لایەنێکی پێویستە ، جاری واهەیە ئاوەڵکارەکەو کارەکە لەگەڵ یەکدیدا سەودا دەکەن‌و مۆرفێمەکە تەنها بە لایەکیانەوە دەلکێ ، لە بارێکدا کە کارەکە تەنها بۆ مەبەستی دووبارەبێ... یان بۆ زێدە تابینا بێ بەهەر دووکیانەوە دەلکێ ، ئەمەش کارێکی گونجاوە، زۆروکەم لە هەر خێڵە زمانێکدا(٥٨) .

---

کارگە شەیتانە ، کارگە گوندەڵە ، کارگە تسە ) . گوندەڵە = خایەدیس ؟ دەگرێتەوە . گوندەڵە : بەو توورەکە قایشینەش دەگوترێ کە ڕاوچی بە خەریتەی ساچمەزەنەوە تفاقی داگرتنەوەی تێ‌دەکرد . ڕوخساری ئەویش خڕکەڵەو گونیلە ئاسایە .

(٥٨) وەك بۆم‌دەرکەوتوە ، دۆخی تابینا لە زمانی کوردیدا سست‌و کەم ئامرازە ، ئەوەش پەیوەندی بە بارەدەروونیەکەیەوە هەیە بە تاوی ئاوو هەواو هەڵکەوتی جوغرافی .

لە زمانی قورئانی پیرۆزدا ، دۆخی تابینا ، دیاردەیەکی زەبەندی فرەئامرازە ، چونکە گرۆهە دوێنراوەکە ئەو پەڕی زبرو سەخت‌گیربوون ، بە نموونە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ، شەش ئامرازو بێژەی تابینای تێدا هەیە ، کە دەفەرموێ : « فورب السماء والارض انه لحق مثلما انکم تنطقون » .

لێرەدا بێتو کارەکە شێنەیی بێ ، یان بۆ گەڕانەوەبێ ، ســــەودای لەمەوبەری لەگەڵدانا کا ، وەك لەم چەند نسوونانەدا ، دەکەوێتە بەرچاو :

**ا ـ بۆ دووبارە :**

ـــ دارا نووست ⟵ **دیسان نووست •**

ـــ **دیسانەوە نووست •**

ـــ **دیسان نووستەوە •**

ـــ **دیسانەوە نووستەوە •**

**ب ـ بۆ گەڕانەوە :**

ـــ دارا دیسان گەڕا ×
ـــ دارا دیسانەوە گەڕا ×
| **هەڵـەن •**

ـــ دارا دیسان گەڕایەوە
ـــ دارا دیسانەوە گەڕایەوە
| **راستن •**

**ج ـ بۆ شـێنەیی :**

ـــ دارا دیسان خولا ×
ـــ دیســانەوە خولا ×
| **گەردان‌ناکا •**

ـــ دیسانەوە خولایەوە / راستە •

**د ـ بۆ زێدە تابینای دووبارە :**

ـــ دیسانەکە نووست •

ـــ دیسانەکەوە نووست •

ـــ دیسانەکەوە نووستەوە ••••

لێرەدا ، نیشانەی شوناس بە ئاوەڵ کارەکەوە لکاوە • ئایا ئەو ئەرکە دەبینێ کە بۆ یادخستنەوەی شتی لەوەبەر ناسراوە واتە ( معهود خارجي ) •• ؟

بێ‌گومان نەخێر • بەڵام لە سروشتی زمانی کوردیدا لواوە کە بۆ رازاندنەوەو تابینا لە سوورگەی خۆی دەربازبێ •

سەرنجێکی ورد :-

گوتم : دیسان ، دیسانەوە ـ لە « دیس » کەوتوەتەوە • ئایا پەیوەندی مانەند بە دووبارە ـ وە چیە ؟ •••

هەر شتێك یان هەر حاڵەتێك کە مانەندو وێچووی لایەتێکی دیکەبێ ، نزیکە لە دووبارەوەبوون ؛ کە دەڵێین :

( دیسانەوە هات •• ) ئەوە دەگەیەنێ کە کاری هاتنەکەی بە چەشنی کاری هاتنی لەمەوبەری بەجێهێناوە • لەو بارەوە ئەوەندە خۆی لە جوولانی کارەکە هەڵدەخزێنێ سەودای مۆرفیمەکەی لەگەڵدا دەکاو لەوی دەپسێنێتەوەو بەخۆیەوە دەلکێنێو ئەوەندەی‌دی کارەکە دەبزێوێ ، وەك : ـ دیسانەوە نووست ـ مانەندی نووستنەوەیەکی‌دی زەق‌دەکاتەوە •

ئەو مۆرفیمە ئەوەندە بە تەوژمە لەدووبارەو مانەندی تاقە رووداوەی تافە وشە دەربازدەبێ بۆ باری گشتی لە بەندو پەرەگرافی نووسینو ئاخاوتندا بەبێ ئەرکی‌سەرەکی بەکاردەهێنرێ •

« هەمیسان بۆمبا ، ناوی کەوتە ناو
کەوتە پەلە پیاوی کەم زراو »
« پیرەمێرد »



٤ - لێکۆڵینەوەی قاڵبی ( هاتەوانێ ) :

لە بەشە رەخنەی ئەم کتێبەدا ، خستمە بەرچاو کە هەندێ زمانەوان رواڵەتی « ەوانێ » ی وەك دیاردەیەك حەلێب کردوەو کردویەتیە برالەی ( ەوە )ی دووبارە .

* ئەگەر بۆ باری سەرنجیش بێ وا دەخوازێ کە بە چەند نموونەیەکەوە ئەو دیاردەیە زەقبکەمەوە ، جارێ گومان لەوەدا نیە کە تێکڕای « ەوانێ » پاشگری سەربەخۆی هاوسەری ( ەوە ) نیە ، ماوەتەوە روخساری « انێ » ئەویش تێکڕا سەربەگەردانە ، یان تێکڕا زێدەیە ؟ دووریش نیە کە لەم نموونانەدا زەین بترازێ :

أ - بەردەم هاویشتنێ . بەردم

ب - بەردەم هاویشتنەوانێ . بەردم

أ - ماچێت دەدەمێ .

ب - ماچێت دەدەمەوانێ .

با نموونە بەشی - أ - ناوبنێین کاری ( انتقالی ) و بەبێ مۆرفێمی دووبارە[٥٩] ...

---

(٥٩) کاری انتقالی نۆبەرە بابەتێکەو مامۆستا مەسعوود محەممەد ، لە کتێبەکەیدا « چەند حەشارگەیێکی رێزمانیکوردی » زەفەری پێبردوەو هێشتا سەرەتای زەینکاریەکەو زۆری بەبەرەوەیە :
أ - تاوتووی مۆرفێمی دووبارەی لەگەڵ ئەو خێڵەکارەدا نەکردوە ..
ب - ئەوەی ساغنەکردوەتەوە ئایا راناوی انتقالیی « ێ »ی « دەدەمێ ، هاویشتمێ ... هتد » سەربەخۆن یاننا ؟ . بەکورتی وای بۆدەچم کە جێگری پریپۆزشنبێ ، بەم رەنگە : ماچێت دەدەمێ = ماچێت پێ دەدەم .
بەردم بۆ هاویشت = بەردم هاویشتێ .

بزانین لە کاتی لکانی ئەو مۆرفیمەدا چۆن راناوە انتقالیەکـە « یَ » دەپارێزرێ ؟ .. یان روخساری مۆرفیمەکە چی بەسەردا دێ ؟ .

گەردانی یەکەم :ـ هاویشتمێ / وە ـ بە تێچوونی بزوێنـــە بەرایی ( ەوە ) ، وەك لە ( بخۆ / وە ) دا .

گەردانی دوەم : ( دەدەم + ەوە + ـ ن ـ ی تێوبڕ + یَ ـ ی انتقالی= دەدەمەوەنێ ) ئنجا گۆڕینی بزوێنی ( ە ) بە ( ا ) = دەدەمەوانێ .

نموونەی گۆڕان کاریی ( ە ) و ( ا ) وەك : ( چەنەگە ، چەناگە ـ مۆلگە ، مۆلگا .. ) .

بۆ تێوبڕی ـ ن ـ ش ، وەك لە رێژەنـاودا : ( گوتـە + ن + ی = گوتەنی ) یان وەك ( سووتەنی ) .

بەهەرحاڵ وەك یاسایەکی گشـــتی ناتوانین ( ەوە ) ی دووبـارە لـە خێڵەکاری انتقالی قەدەغەبکەین و بـە شیکردنەوەیەش نـەبێ ناپارێزرێ . جا ـ ئەگەر بەرەو هەوارگەی سۆرانو موکرییو ســــەرووی رۆژئاوای شارباژێڕ بابدەینەوە ، ئەوا قالبی ( هاویشتمێ / وە ) وەردەگیرێو سووكو ئاسان بەر گەردانی یەکەم دەکەوێ .

ئەگەر بەرەو شاری ســــلێمانی بینەوەو رێژگەی کاری انتقـالی لێ تاوبـدەین ، دەبێ پەنـــابەرینـــە بـەر گـــەردانی دوەمو رێژگـــەی ( هاویشتمەوانێ ) بێنەکایەوە . بە حوکمی ئاسانی ، زەین بۆ ئـەوە دەڕوا کە « انێ » زادەی گەردان نەبێو هەمان رێژگە بەم چەشنە ســــازابێ : ( هاویشتمەوە / انێ ) بە تێچوونی بزوێنی دوایی ( ەوە ) ....

ئەمەش ئەگەر وەهابێ ، قالبەکە فڕی بە کاری انتقالیەوە نابێ ، واتـە ئەوسا « یَ » بە بەشێکی تێکڕای « انێ » حەلێب دەبێ ، کە زێدەیەو بۆ تابینایە .

قەدەغە لێکردنی ئـەو مۆرفێمە لە خێڵەکـاری انتقالی ـ ئـەوەنـدە ئاسان‌نیە ••• !!

**داکشانێك بەرەو دیاردەی « انێ » :**

ئەمرۆ بووەتە تایبەتێکی ئاخاوتنی خێزانە شاریەکانی سلێمانیو باری شارستانی بووژاندویەتیەوە •• ماوەیەکی زۆر ( ١٩٧١ – ١٩٧٢ ) لەمیانی سـﮯـﯚراخی چەند دەقە تایبەتییەکی زماندا سـﮯـەرنجم‌دایە دەمودەراوی قسەکەران ، چونکە لە میانی باس‌وخواسی ناراستەوخۆی ئەوانەوە ، دەقە ئاوازەکان باشتر بەرهەستم دەبوون •

لە ئەنجامدا ئەم لایەنانەم بۆ دەرکەوتن :

١ ـ بە ئەندازەیەکی زەبەند لە قسەی خانمانەو ژنی سەرەدا بەگورەو پتر لە دۆخی دووبارەدا ، کەمتریش لە قسەی پیاواندا •

٢ ـ ئەوەندە پەرەسەندوە ، بە دوای کارو راناوی ئیشاریو بەشـــــە ئامرازو ئاوەڵکاردا تاوی دەدەن •

٣ ـ لە شارباژێریشدا پتر لەگەڵ پاشکۆ ئامرازو راناوی ئیشـــــاریدا بەکاری‌دەهێنن ••• وەك : ( لەبنەوانێ هەڵم‌کەند •• ئەوەتانێ لـــە کوتێدایە ••• هتد ) •

٤ ـ لەگـەڵ چاوگدا گەردان‌ناکا ، نـاگوترێ : « خولانـەوانێ » کـــە هێزەدەنگ = ئاکـسان لەسەر بڕگەدەنگی « نێ » بێ • ئەم لایەنە ، نهێنییەکی زمانمان بۆ ئاشکرا دەکا کە تابینای حوکمە جا لـە دۆخی گەڕانەوەدابێ یان دووبارە یان هـــەر بۆ دیاردی‌کردنە لە رووداني کوتوپڕیدا ، دۆخی تابیناش چمکی رووداوو حوکمی ئاخاوتنـــە • هەر لە بەر ئەوەشە ( ئاهەنگی ـ ێ ـ ) ی دوای ( انێ ) کە دەڵێین :

هاتەوانێ ، ئەوەتانێ[٦٠] چێژی راناوی هەیە بۆ دابەزینی باری رووداوەکەو زەق کردنەوەی .

٥ - پتر سەر بە رستەیە بۆیە گومان دەبەم کە لە ئاوەڵکارەوە خۆی رادابێ ، ئەم لایەنە بەکارهێنانەش پتر تایبەتی شارباژێڕەو هەر لەوێوە بەرەوشارە تازەکەی بابان تەکانی‌داوەو پەلی‌هاویشتوە .

٦ - لە ئەو لێکۆڵینەوەوە دەردەکەوێ کە زمان بەبێ‌هۆ شت لاناباو شتیش راپێچ ناکاتە نێو خۆیەوە ، کەواتە فۆرمی ( انێ ) هەرچەندە ، حیسابی زێدەی بۆ دەکرێ ، لە زمانی ئاخاوتنی ناوچەکەدا ، دیاردەیەکەو لە برەودایە .

٧ - شوکرانەی گەرەکە ، کە ئەو زێدەیە ، نەی‌توانیوە خۆی بخزێنێتە تۆمارگەی ئەدەبیاتی کۆن‌و تازەمانەوە .



❋ ب - مۆرفێمی دووبارە کە بەدوای بزوێنەوەبێ :

١ - بەدوای « ا » ی بزوێندا :-

« گەرمی‌و تەڕیی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە

پشکۆی گوڵاتەشین بەنەسیم بوو گەشایەوە »

« نالی »

---

(٦٠) ئەوەندێکی سەرنجی رێزمانە کوردیەکان بدەین گوتنەوەی ئەم چەند بێژەیەیە : راناوی ئیشاریی ( ئەوە ، ئەمە ، ئەوانە ، ئەمانە .... ) لە دیاردەی ( ت )ی « ئەمەتە ، ئەمەتا ، ئەوەتانێ ) نەدواون ، ئایا ئەو زێدەیە چیە ؟ یان لە نێوان ( ئەوەتا ، ئەوەتە ) دا کامیان بنجیە ؟ . لاباسێکەو ماوەی لێکۆڵینەوەیم‌نیە .

٢ ـ بەدوای « ە » دا :ـ

أ ـ « ڕێیـەکی وامـان نەدیـوەتـەوە

سـەرکەوتنی لێبوەشـێتەوە »

ب ـ « بـەڵام تۆ باشـی لێـك بـدەرەوە

چاوبەست لە چاوی خۆت بکەرەوە »

« لەپەندەکانی پیرەمێرد »

٣ ـ بەدوای « ی » بزوێندا :ـ

« هاتەشـار بـە دزیـەوە

زەڕنگەرێکی دۆزیـەوە »

« هەمان سەرچاوە »

٤ ـ بەدوای « و » ی بزوێندا :ـ

أ ـ « ریسەکەمان بوەوە بەخوری » .

« پەندی پێشینان »

ب ـ « سـبەینێ ڕۆژی لێ بۆوە

وەك ڕۆژان بۆ جووت چۆوە »

« لە پەندەکانی پیرەمێرد »

٥ ـ بەدوای « ۆ » دا :ـ

« پێیان وتم : بخۆرەوە ، بخۆرەوە ، بخۆرەوە

ژەنگو ژاری دەروونەکەت بشـۆرەوە »

« کاکەی فەللاح »

٦ ـ بەدوای « ێ » دا :ـ

أ ـ ئەوەی دەی‌لێ ، نای‌لێتەوە •

ب ـ بڵێ ، بڵێرەوە •

**پێشەتایەکو شی‌کردنەوە :**

أ ـ بزوێنی « •• ا ، ە ، ێ ، ۆ » توانایان‌نیە کـــە لـەگـــەڵ بزوێنی دیکەدا ، ببنەوە بە دەنگدار •

ب ـ بزوێنی « وو = û »ی درێژو « ی ، یە = î » ی فـــرە داکشاو ، لە باری تیژیدا بە بزوێنی دیکە ناجوولێن و نابنەوە بەدەنگدار ، داکشاو ، لە باری تیژیدا بە بزوێنی دیکە ناجوولێن و نابنەوە بەدەنگدار ، لـە کاتێکدا جوولێنران ، لە دۆخی « و ، ی » ی کورتـدا دەبنـەوە بـە دەنگدارو بە هەمان بنکەی پێشوو • ئەمە باوەڕی خۆمەو لە ئەنجـــامی بەراوردەوە لێی دڵنیابووم •

بەڵام مامۆستا تۆفیق وەهبی بە شێوازێکی‌دی لێی‌دواوە :

« دوو واوی ـ پاروو ـ بۆ ڕێك ( وو ) ی درێژە ، بەڵام لە نموونەی ( پارووەکە ) دا بەهۆی بزوێنی ( ە ) وە ، واوی یەکـەم کورتـە بـزوێنی ( ر ) یەو ، واوی دوەم دەنگدارەو بەهۆی « ە » وە جوولاوە » •

تێبینیم دەربارەی ئەو شی‌کردنەوەیە :

بەپێی ڕێنووسەکەو لە گۆکردنی سلێمانیانەدا ئاوا دەردەکەوێ •

بەڵام / •• وو / ی درێژ بە واوێك بنووسرێ یان بە دوو یـان بـە هەر نیشانەیەکی دیکە شکڵ نووس‌بکرێ ، لە خۆیدا تاقە بزوێنیەکەو بـە چەشنی ( ە ، ا ) • جا ـ چۆن ئەمانە ناکرێنە دووکەرتەوە ، / •• وو / ی درێژیش دووکەرت نابێ •• گریمان بە / •• و / ی کەشـــیدەدار یان بە

پیتی لاتینی نووسیمان ، له هه‌مان دوو وشه‌ی پێشـــــوودا که‌رت‌کردن پەیدانابێ ، وه‌ك :

« Parû - Paruweke »

یـــان Pariweke

له باره‌ی « ی » وه نووسیویه :ـ

« اذا أتى « ی » بعد یاء صوتیة ، یكون حركة لها »[٦١] •

دوای ئه‌و ده‌ســـتووره ، نموونه به ـ « كۆیی ، پاییز ••• هتـد » ده‌هێنێته‌وه •

ئه‌مه‌ش شی‌كردنه‌وه‌یه‌كی به‌رفراوانی ده‌وێ ؛ لـه رووی ده‌ربڕینه‌وه بگرین : ( كۆیی ) ، راسته •• كه ( ی ) دووه‌م ، بزوێنــه بۆ یه‌كه‌میان •• به‌لام له‌و نموونه‌دا « ی » كۆیی ـ له پێشـــــدا ده‌نگدار نه‌بووه و ئنجـا بزوێنی به دوادا هاتبێ ؛ بڕوام وایه كه قه‌باره‌ی ناوه‌كـه ( كۆ ) یـه و دوا پێوه‌لكانی ( ی ) نیسبه‌ت ، دووبزوێن لێكیان‌داوه‌و به / یـ / كۆنسۆنانت تێوبڕكراون •



١ ـ له سه‌رجه‌می ئه‌و نموونانه‌دا ، مۆرفێمه‌كه پاشــگره‌و لـه قالبی « ه‌وه » دایه‌و ده‌ست‌به‌رداری بزوێنه به‌رایی نه‌بووه • ئـه‌وه‌ش ده‌لێمه‌وه كه له ئه‌نجامی كێشه‌یه‌كی درێژخایه‌ندا ، هه‌ندێ له زمانه‌وانه‌كان‌و به چه‌ند قۆناغێك ، هێمایه‌كیان بۆ تێوبڕكرد ، به‌لام هۆی په‌یدا بوونی‌و جۆره‌كه‌ی‌و

(٦١) قواعد اللغة الكردية ، بغداد / ١٩٥٦ ل٢٤ . لێره‌دا مه‌به‌ســـــــتم ره‌خنه‌نیه . به‌چاو ئێره‌وه پتر به‌و لایه‌نه ده‌نگســازیه‌وه خه‌ریك‌نابم .

گونجان و باری دەنگســـازی تێدا شی‌نەکرایەوە[٦٢] • لەبـەر ئەوەی کـە نەسەرەتای بەراوردو پشـــــکنین‌دام ، بەرەوای نازانم لـــە نێوقەدەوە تێ‌هەڵبچم ، تا رادەیەکیش ئەم بنەیە خاوکردنەوەی دەوێ • بـا زمـــان دۆستان لە نیازم‌بگەن ، کە تاکە مەبەســــتی من لەم لێکۆڵینەوەیەدا هــەر ئەوە نیە کە بە دەورو خولی بنجێتی‌و نابنجێتی‌ی بزوێنە بەرایی « ەوە » دا ، بێم • سەرجەم یەکبوونی نەتەوەیەك‌و یەکبوونی سەرانسەری زمانەکەیەتی لە گەردیینی پاشگرێك‌و نیشانەیەکدا • ئەگەر لایەنە روخســـاریەکانیـان چسکێك‌بن ، دەهـا نهێنیە زمـانی‌و کارەســـاتی قەڵەم زەدانـەو ئامانجی دووروو نزیك لە مەسەلەی زمانەکەماندا ، سەرهەڵدەدەن •

---

٢ ـ لـــە کـــاری ( گەشـــا + یـ + ەوە ) دا ، یـــان کـــاری ( کوژا + یـ + ەوە ) دا ، ئـاشـــــکرایە کە دەنگی « یـ » دەنگدارەو نێوبڕە • هەڵکەوتی ئەو دوو قاڵبـانـەو هەرچی بەو دانوێنیە بێ ، بـەبێ گیروگرفت‌و رەوانەو بەتایبەتی لە ئاخاوتنی هەرێمەکەدا •

٣ ـ أ ـ رێیەکی وامان « نەدیوەتەوە » :

١ ـ رێم‌دی — رێم‌نەدی

٢ ـ رێم‌دی + وە — رێم‌نەدی + وە

٣ ـ رێم‌نەدی + وە + ت + ەوە = • • •

٤ ـ رێم‌نەدی + وە + ت + ەوە + انێ = • • •

---

(٦٢) بۆ بەشی یەکەم ... یەکدوو زمانەوان ئەم قســـــەیەیان درکاند : « لە وێنەی ـ خولایەوە ، هاتوتەوە ـ دا ، ی ، ت ـ دوو بزوێنیـان لێکدی ترازاندوە . نا بەدڵانەش نیگایەك کەوتە سەر / ر / لاواز ، لە وێنەی ( بکەرەوە )دا ، ئەویش نەك بەسفەتی نێوبڕ ، بگرە بە سفەتی دەست‌کردێکی تازە پەیداکراو .

لەم ڕێژگانەدا ، بە بەرچاوەوەیە کە تێکڕای پاشگرەکە ( بێجگە لە نموونەی پێنجەم ) خۆی پاراستوە • بۆ تێنەچوونی بزوێنە بەرایی ، تێوبڕی ( ت ) تێوباخەڵ بووە •

بۆچی تێوبڕەکە ( ت ) یەو لەبەر چیە ••• ؟

جارێ هەر ئەوەندە وەڵام دەدەمەوە کە بۆ ترازاندنی جووتە بزوێنەو دەنا لایەکیان تێدا دەچێو زیاندەگەیەنێو قاڵبی هاوبەش پەیدادەبێ • لە نموونەی پێنجەمدا ، بزوێنی دواوەی لەبەر ئەوەیکە ئاڵۆزی بەرپاناکا ، تێداچووە ، وەك ( نەدیوەتەو ••• انێ ) •

ب ـ چاوبەست لە چاوی خۆت بکەرەوە ـ •

لەم کارەداخوازیەشدا ، وەك لە نموونەی ـ أ ـ دا ـ پاشگرەکە بەدوای بزوێنی « ە » وە ، خۆی پاراستوە ؛ تەنها جیاوازی لەوەدا هەیە کە بەدوای رابوردووی نزیکدا ، تێوبڕی « ت » سازاوەو بەدوای داخوازیەکەشەوە ، تێوبڕی « ر » ی نەرم رەخساوە • لەوانەیە زەین بترازێو گومان ببرێ کە « ر » یەکە هی قەدە کارەکەبێ ؟ وەك لە « کردن ، کردم » دا ، دیارە •• هەر بەنیگایەك ئەو گومانە نامێنێ •

١ ـ کارە ڕووتەکە ـ بکە ـ یەو ( بکەر ) نیە ، لەم ڕێژگەیەدا تەنها ڕەگەکار ( ك ) ماوەتەوەو دەنگی « ر » بە گەردان لەناو چووە ، وەك : ( چوون ـ بچۆ[٦٣] ـ بچۆ + ر + ەوە ) یان بۆ هەمان مەبەستی تێوبڕ :ـ

---

(٦٣) ئەگەر بابدەینەوە بۆ باری وشە گەردانیی ریشەیی ، ڕێژگەی ( بچوو ، بچوە ) ڕەسەنترە ، وەك لە ئاخاوتنی سنەیانەو بڕێ هەرێمی دیدا . دیسان ( بنوە ) ڕاستترە لە (بنوو) چاوگی ـ بچۆ ـ چوون ـ ەو ـ چۆن ـ نیە . زمانە ئەدەبیەکە سەرپشکەو نایان گێڕێتەوە بۆ دۆخی گەردانە ریشەییەکە .. !!

لەم نموونەیەدا « بچۆ + ر + ە ـماڵێ » لە کارەکەدا تێوبڕی « ر » بۆ پاراستنێکی دیکەیە ، واتە پاراستنی « ۆ » ی ( بچۆ ) لەگەڵ « ە » ی سواوەی ئامرازی پەیوەندی = پریپۆزیشـــــن ـ دا • تێوبڕایەتی « ر » لێرەشدا خۆی داکوتاوە ••• هەمان رستە لەسەر تانوپۆی ( هاتە ماڵێ ) دەست بەرداری ئامرازەکە نابێو بەڵگەیەکی تۆکمە کە زادەی خواستێکی زمانیە ، بە دوای کاری داخوازیدا • زمانی کوردی بۆ چارەسەری گرفتی دوو بزوێن ـ لە وشە سازیدا ـ دوو رێگەی خۆش کردوە •

أ ـ تێچوونی یەکێکیان ، کە زیان بەمەبەست نەگەیەنێ ••• ئیدی هەقی نیە بەسەر بنجیو نابنجیەوە • بکەوە ، بڕەوە

ب ـ پاراستنیان بە تێوبڕ ؛ بۆ ئەوەی کە مەبەســـت نەدۆڕێ • لێرەدا بەرەو بنجێتی ـ بەچاو هەردووکیانەوە ، ئەندیشـــەو بیر دەکەونە تەوژمی بەراوردو دەســـتوور چەسپاندن • دوورنەچین خێڵەکاری داخوازی کـــە پاشگری [ ەوە ] یان پێوە بلکێ ، لەوانەیە لە بڕێکیاندا ـ ئەگەر تێوبڕیش نەبێو بزوێنە بەرایی تێدابچێ ـ ئاڵۆزی پەیدانەبێ •• کەچی لە بەرەیەکی کەیاندا بەو تێچوونە ، ئاڵۆزی بەرپادەبێ ؛ لەم حەڵەدا بەربەســـتی زیـــان دەکرێ و دەستووریش بەگشتی ، دادەبەزێ : « هەموو کارێکی داخوازی کە بۆ دوەم کەسی تاك بێو لە دۆخی دووبارە ، گەڕانەوە ••••• هتـد ـ دابێ ، یان لـە رستەدا بەرەنگاری « ە » ی پەیوەنـدی بێ تێوبڕی « ر » نەرم وەردەگرێ » •

لەوەش بەئاگاین کە وشە نامۆ لە زێدە ناکا ، بـە مەرجێ زیانبەخش نەبێ ؛ بە نموونە : چ بڵێین ( بڵێوە یان بڵێرەوە ) مەبەســـت لە نێو ناچێ ، کەچی لـە ( بکەرەوە ) دا کـە بۆ کاری شـــێنەییە بـەبێ تێوبڕ دەبێتـە ( بکەوە ←←← دەرگایەکە بکەوە ) •

ئنجا بەچی دەزانین کە مەبەست دووبارە دروستکردنی دەرگایە یان
ڕەواندنەوەو کردنەوەی بەرەبەرەیـە ؟ •• یان لـە ( بکەوە ) ی بـەواتـا
( خستن ) بێ ؟

هەروەهـــا لە کاری ( بخـەوە ) دا کـە بۆ دووبارەبێ بـەچی لـە
( بخەوە = بنوو ) هەڵدەهاوێردرێ •• ؟ « ( ر ) » ی نەرمەو

مـاوەتـەوە ئـەوە : بۆچی نێوبڕەکـە دەنگدارێکیدی نیـە ، وەك
( ت ، ن ، یـ ، ••• ) •

جارێ ئەم پرسـیارە لەزماندا ناکرێ !! وەك ئەوە وەهایە کە بڵێین :
فۆنێمی « با » بۆچی « گا » نیە ؟

گریمان ئەم قســــــەیەم نەسەلمێنرا ، بـا چـەنـد نێوبـڕێکیدی
لێ تاقیبکەینەوە :

١ ـ د(٦٤) : ( بکە + د + ەوە ) •

دەبێتە رستە ، وەك لە ئاخاوتنی پشدەردا : ( بکەدەوە=بکە لە وە )•

٢ ـ ن ـ ( بکە + ن + ەوە ) ڕێژگەکـە دەبێتـە کـۆ ، مەبەستیش
دوەم کەسی تاکە •

٣ ـ یـ ـ ( بکە + یـ + ەوە ) ئەوسا کاری داخوازی نابێو دەبێتە
رانەبوردووی ئیلزامی •••

٤ ـ ت ـ « بلێ + ت + ەوە » بەو شێوەیە ڕێژگەکە دەبێتە کاری
رانەبوردووی ئیلزامی کە بۆ سێیەم کەسی تاكبێ •

---

(٦٤) بەلای منـــەوە دەنگی / د / دەبیتـــە نێوبڕ بۆ ترازانـــدنی دەنگی « ر »
نەرم لە « ڕ » گڕ ، لە ڕێژگەی رابوردوو ، رانەبوردووی کارانزر=
مبني للمجهول ـ دا ، وەك : ( دەکرێدرا ، دەکرێدرێ ) . بەڵام دوکتۆر
عەبدوڵلا نەقشەبەندی ( گۆڤاری ژمارەیەکەمی کۆڕ ) پاشـــــــکۆی
« درا »ی بڕداوە و لەگەڵ ئەو بۆچوونەیدانیم .

بەکورتی :

لە هەرێمی ناوەڕاستدا ، ئەو دیاردەیە ، لە جەرگەی زمـانـەکــەدا دروستبووەو خۆکردیە و دەســـــتکاری ناکرێ •• دەنا دەبێتە مایەی ـ ئاڵۆزە زمانی = ملابســـــات لغوية ـ لـــە نێوان چەند ڕێژگە کارێکی جیاجیادا •



٤ ـ « زەڕنگەرێکی دۆزیەوە » :

أ ـ جووتیارەکە پارەی دۆزییەوە •

ب ـ ئەو دۆزی یەوە •

ج ـ دۆزیەوە •

د ـ دۆزیێوە •

لە زمانی قســـــەو نووسینیشدا ، ئەو ڕێژگانە لەکاردان • تێکڕای پاشگرەکەش بە دوای « یی = ī » فرەداکشـــاوو « ی » کـورتـە داکشاودا ، خۆی پاراستوەو بە « ی ، یـ » دەنگدار تێوبڕبووە • جا لـە خودی وشەکەدا پەیدابووبێ یان لە لاوە هاتبێ • بە قیاس لەســــــەر گەردانی ( خولا ـ خولایەوە ) کە لەلاوە هێنابیەتی •• ئـەم کارە ئەوەندە ئاسان نیەو تائیستا زمانەوانەکانمان ، بابەتیانە شییان نەکردوەتەوە •

**شیکردنەوە :**

ـــ کاری ( دۆزیی + ەوە ) لە چاوگی ( دۆزین ، دۆزینـــەوە ) دابەزیوە •

لێرەدا بزوێنی « یی » فرەداکشاو وەك « وو = û » ی درێژ ، لە نووسینی باودا بە دووبارەخۆ دەنووسرێ •• لـە ڕووی شیکردنەوەیەکی

سەرومڕدا ، چەند « ی » کەڵەکەدەبێ ، جا بخوێنرێنەوە یانا پێویستە بۆ باری ساغکردنەوە و گەردان زەقبکرێنەوە :ـ

١ ـ دۆزیی / رابوردووی بینراوێی رەبەقە و بەجووتە « یی » چونکە فرەداکشاوە •

٢ ـ ئەو دۆزیی + ی ـ لەگەڵ راناوی سێیەم کەسی تاکدا ، وەك ( کرد ، ئەو کردی ) ئەوسا دەبێتە : ( ئەو دۆزیی •• ) •

٣ ـ ئەو دۆزییی یەوە / لەگەڵ پاشگرەکەدا • خۆئەگەر « یـ » تێوبڕەکەش ـ کە لەلاوە هاتبێ ـ سەربەخۆ دەمێنێ دەبین ئەوا ئەم پۆلەمراویە دەردەچێ !

« ئەو دۆزییی / یەوە » !!

بمانەوێو نەمانەوێ ، وشـــەکە لە خۆیـدا ئـاوا دەردەچێ : ( یی داکشاو + ی ـ راناو + ی ، تێوبڕ + پاشگرەکە •• ) ئەمە لە مەرجێکدا کە بە قیاس لەســــەر ( بایدایەوە ) تێوبڕەکە لەلاوە هاتبێ ، واشنەبێ ، سێ / ی / بەرکەماڵە !!

ئەو ساختمانە وەك خۆی نامێنێتەوە ، ســـازگەی دەنگو گۆکردن میکانیکیانە لێی دەکەوێتەکار :

١ ـ باری راناوەکە کە بۆ سێیەم کەسیتاکە و لە قاڵبی « ی » دایە :

ئەگەر ( دۆزیی بەرانبەر بە ( دۆزییم ) بکەین یان بە کەشـــیدەوە ( دۆزیّ ، دۆزیّم ) دەبێ لە ئەو ( دۆزیی + ی ) شدا مابێو راناوەکە لـە ناوچووبێ ، چونکە بەو حاڵە گۆناکرێ •

٢ ـ دەمێنێتەوە « یی » فرەداکشاو + یـ ـ تێوبڕ :

أ ـ دۆ / زیی / یە / وە ـ بە پێیبڕگەو لە زمانی نووسینداو لـە قسەی سلێمانیدا •

بڕگەی/زیی/وەك/سیی/ گۆدەکرێ ؛ بەو پێیە « یـ » ئێوبڕەکـە کەبەین کەوتوە لەگەڵ ـ ە ـ ی بەرایی پاشـــــــگرەکەدا ، بڕگـەیـەکی سەربەخۆی لە گۆکردندا پێكهێناوە ٠

ب ـ دۆزی/یەوە : دەربڕینی بڕگەی/زی/بە « ی » کورت + یـ ـ ئێوبڕ لە زمانی قسەدا ، زۆر بەگوڕە ٠

ج ـ دۆ / ز ... / یەوە = Doziyéwe ئەمەش بارێکیکەیەتی لە گوتندا ، تابەرەو هەرێمی سارد هەڵبکشــــێین بڕگەی گیر ، خۆی دەسارێنێ ٠

لەم دوو هەڵکەوتەدا سەودایەکی تایبەتیان دەوێ :

ـــ ی ـ کورت ئاســـــاییانە لەگەڵ بزوێنیدیکەدا ، دەبێتەوە بـە دەنگدارو بەلای منەوە جێی کێشە نیە ، لە دۆخی فرەداکشاویشدا دیسـان توانای هەیە بێتەوە بەبزوێنی کورتو ئنجا بە زەبری بزوێنیدیکە بێتەوە بە دەنگدار ، لەم حەلەدا بۆمان هەیە کـە « یـ » ئێوبڕ لـە لاوە نەهێنین ، ئەوسا یا بریتی دەبێ لـە راناوەکـە یان هـەر ( ی ) بزوێنـەو جوولاوە ٠ پەیڕەوی ئەم لایەنە کە جوولاندنی بزوێنی « یـ » یە ، وەك دەنگدار بـە بزوێنیدیکە ، زەینکارییەکی وردی دەوێو بە دەســـــــتوورێکی سرکی دەزانم[٦٥] ئەوەیکە نایەوێ خۆی پێوە مانـدووبکا ، بـا پـەیڕەوی ئـەم دەستوورەیانبکا :

---

(٦٥) لە بەحســـــەکەمدا « دواوانێك بۆ رێنووسی کوردی » بـەو بنکەیـە چارەسـەری زۆر گرفتی ئیملاکردوە . ئەوەنـدەیکە بـەلای منـەوە پەسندە ، هێشتا زمانەوانەکانمان پێی ئاشنانەبوون .

نیگایەك : ئەو بەحســـەشم لە سالی ١٩٧٨ ـ دا داناوە ، بێتو هەندێ قۆرتی نەهاتایەتەرێ ، ئەوەندەی نەدەخایاندو ، چاپمدەکرد ، لەگەڵ ئەوەشــــــدا چەند ئالقەیەکیم لـە رۆژنـامـەی هاوکـاریدا بلاوکردەوە ... ١٩٨٠/٤/٢ ئالانی .

« کاتێ پاشگری ـ ەوە ـ کەوتە دوای بزوێنی / ٠٠ ا ، ٠٠ ی / ئێوبڕی ـ یـ ـ لێکیان دەترازێنێ ٠٠ وەك : ـ خولا + یـ + ەوە ، دۆزی + یـ + ەوە ٠٠٠ » ٠

بەچاو خۆمەوە ـ بەبێ خۆزەحمەتدانو زیان گەیاندن بە ساختمانی وشەکە ـ دەنووسم : ( کردیەوە ، دۆزیەوە ) بۆ ژێری فرەکورت کە بە ڕێنووسی لاتینی / i / یە ، بەم ئەلفوبێیانە داین نابێ ٠ سێ پلەی ژێر : ( فرەداکشاو ، کورت فرەکورت ) تەنها بە نیشانەی « ی » نا پێوڕێن !!

تەوژمێکی دیکە لە هەمان ساختمانداکە بەبێ زاروکاکیلە ماندووکردن ، دەگوترێ :

« پارەم دۆزیێوە = Doziyêwe » ئەمەیان بەدەم خۆشەو بەلام لە رکێفی دەستور سازیی زمانی نووسیندا نیە ؛ لێرەدا بزوێنە بەرایی [ ەوە ] سووڕاوە بە « ێە » و بڕگەی « یێ » شوێنی « یە » ی گرتوە ٠٠ ئەمەش دەگەڕێتەوە ، بۆ خۆ قوتارکردن لە دەربڕینی بڕگەی تانیو پۆیی و سوانەوەیان لە ( لارەبڕگە ) ٠٠ دا ٠ لە خێڵە زمانەکاندا دیاردەیەکی بەتەوژمە ، نەك زمانە ئاریەکان بگرە زمانی یەك گرتوی عەرەبی کە خەملاوو بەستراوەی نامە ئاسمانیەکەیانەو ئەویش لەسەر لارەبڕگە بنیاد نەنراوە ، بەهیچ کلۆجێ ( لە زمانی قسەدا ) دەرەقەتی سوانەوەو لارەبڕگە نەهاتوە ؛ بە نموونە : « بێنکم=بَیْنَکم ، وێن=أَیْن ، حلاوَە حلێوە ٠٠ هتد » ٠

( ە ) مەبەستم ئەوەیە کە لە وشەسازیدا ، بەرەو سوانەوەو لارەدەنگیی هەڕەمە ، هەنگاو نەتیێن ٠ زمانی قسەش ئازادەو زادەی رۆژانەیەو بەر رکێفی گرامەرێکی تایبەتی نابێو نەبووە ٠ کەواتە با چەقێکی ژیرانەبگرین لە نێوان فەلسەفە گەریو هەڕەمەکاریدا ٠

★

ه ـ به دوای [ •• و ] ی بزوێندا :

أ ـ ریسەکەمان بوەوه بەخوری •

ب ـ رۆژی لیٚبۆوه •

— بوو : کاری رابوردووی رەبەقەو لەیەك برگەی تەواو پێكهاتوه :

( بـ ـ دەنگ + وو ـ ی درێژ ) •

— بوو + ەوه :

به دەستووری ( و ) ی بزوێن + بزوێن ، دەبێتەوه به دەنگدارو بە هەر دووکیان برگەیەکی سەربەخۆ ـ له گۆکردندا ـ دەسازێنن •

له لایەکەوه [ و = وو ] ی دوای ( ب ) لێی دەپسێتەوه ، له لایەکی کەشەوه ، بزوێنه بەرایی ( ەوه ) دا دەبڕێ ، بەم چەشنه نیمچه برگەیەك و دوو برگەی تەواو بیچمی کارەکه دروستدەکەنو بەم جۆرەش گۆدەکرێ :

( بـ •• / وه / وه ⟵ Biwe we )

ئەمەش باری راستەقینەی گەردانی ئەو کارەیه • بەلام راهاتنی لچولێو ، هەرێم تا به هەرێم ، رەخسانو تایبەتی خۆی هەیه له کۆکردنەوەو لوولکردندا •

ناوچه تازەکەی بابان ـ که تا رادەیەك له رووی دەنگسازیەوه ـ بە دەسته شێوەکانی گۆران ، کاریگەربووه ـ ئاخێوەرانی سلێمانی ، کەمتر لچولێویان راهاتوه به دەربڕینی نیمچه برگه له سەرەتای وشەداو لەگەڵ جۆشدانی به برگەی تەواوەوه • بۆ ئیستیقامەی تەقینەوەی دووبرگەی « وه / وه » به دوای « بـ •• » گیردا ، بۆنه دەنگ = اشمام ـ و ـ ی

بۆ دەکەنە بەرایی .. ئەوساکە لچولێوەکە ، بارێکی کۆکراوەی دەرپۆقیو – وەك لەکاتی فیتوو لێ‌داندا – وەردەگرێ‌و بێ‌پسانەوە سێ بڕگەی تەنافی ( أفقی ) تەواو دەردەچێ ، وەك : [ بو ⟵ وە ⟵ وە ⟵
Bu / we / we ] .

ئەم شـێوە گۆکردنە تەنافیە ، بەرەوکزیـەو لچولێو هەســـــت بەماندووبوون دەکا ، ئنجا بە بارێکی‌دیکەدا خاو دەبێتەوەو یەکەم بڕگەی ( وە ) لە نێو دەچێ ، بەکارتێکراتێکی تایبەت هەڵدەچەرخێتەوەو خۆی لە بزوێنی ( ۆ ) دا ســــاغ‌دەکاتەوەو دەنگی ( ب ) ی گیر ڕادەکێشێ ، لـەم حەلەدا وشەکە بەم دوو بڕگەیە گۆدەکرێ :

« بۆ / وە ⟵ Bo / we » یان – بەربۆوە – .

**ئاوڕدانەوەیەك :**

پەی نـەبردن بـەم جۆرە شی‌کردنـەوانـە زەینی بـڕێ زمـانـەوانی ترازاندوە ، کە بڵێ :

« بۆوە – کارێکی سەربەخۆیەو ئەوەی پێی دەگوترێ پاشــــگری [ ەوە ] کۆمەڵە پیتێکە لە رەگ‌و ڕیشەی کارەکەیەو هیچ پەیوەنـدی بـە کاری [ بوو ] وەوە نیە ؟!



٦ – بەدوای بزوێنی « ۆ ، ێ » دا :

وەك : ( بڕۆ + ر + ەوە )

( بڵێ + ر + ەوە ) .

لێرەشدا ، نێوبڕی « ر » تێکڕای [ ەوە ] ی پاراســـــتوە ، وەك گوتمان سەلیقەی زمانەکە سازاندوویەتی . بۆ ترازاندنی ( ە + ە ) چەندان

تێوبڕی سازاند ، دەبینین کە کارەکـە داخوازی‌بێ‌و بۆ تاك‌بێ‌و بەدوایـدا ئامرازی پەیوەندی ( ە ) هاتبێ هەر تێوبڕ « ر » یە وەك :

« وەکـــو زلفت کـــە موتیعی بـەری پێیـە
تێکی مەشکێنە بەجەفا ( مەی خەرەلاوە ) »
« نالی »

لە وێنەی ( دەڵێ + ت + ەوە ) دا کە کاری رانەبوردوە ، بە بڕوای ئێستام تێوبڕی ( ت ) بەشە ڕاناو نیەو لەمەوبەر لەسەری رۆیشـــتم‌و ئەو بایەخەی کە راناوی کاردەی‌بینێ ، ئەو زێدەیە دەوری‌نیەو لە تێوبڕایەتیدا بەگوڕەو لەگەڵ راناویشدا دەگوترێ‌و ناگوترێ :

« بۆجوێ بوونەوە ، بۆ زەخم‌و نیشانەی ئەسەرێ
تیری موژگانی درێژت لـە جگەر ( تێ‌دەپەڕێ ) »
« نالی »



## لایەنێکی فەرامۆش‌کراو

* ویستم ئەم لایەنە بخەمە دوای بەراورد لە شێوەکاندا ، بەڵام بۆ ئەوەی‌کە لە دەستەشێوە گەشە سەندووەکەی سلێمانی ، نەپسێمەوە ـ وەك ئەلقەیەك ـ بەسەرم کردەوە ٠٠٠ بەبێ هیچ بەرەنجامییەك زمانەوانەکـــان وایان راگەیاند کـە مۆرفێمەکـە هەر یاوەری چاوگ‌و کـارە ، لـە رووی قەبارەوە لە تێوان روخساری [ ەوە / وە ] دا رواڵەتانە خراوەتە بەرچاو ٠ لەگەڵ ئەوەشدا کە بەرەو تێکڕای [ ەوە ] دادەکشێم ، وا دەبێ هـەر لـە شێوە ئاخاوتنی سلێمانیدا ، سێیەکە بەشی دەربکەوێ‌و بە چەشنی دایناميت دەتەقێتەوە !!

ئەو ئەرکە سەرەکیەیکە تا ئێستا بێسەرو سۆراخبووە ، خۆیزەق دەکاتەوە ، ئەویش دۆخی بەکارهێنانیەتی ، لەگەڵ ئاوەڵناوی کاراو بەرکاردا • بۆ هەمان مەبەست چەند رێژگەو فرێزێك دەکەمە دەستەبەر •

**یەکەم :**

نموونەی ئاوەڵناوی کارا :ـ

شکا ـ شکاو ⟵ بەردی شکاو
شکا ـ شکاو ⟵ گەڵای شکاوە

نووست ـ نووستو ⟵ منداڵی نووستو

سوا ـ سواو ⟵ چەقۆی سواو
سوا ـ سواو ⟵ کەشکی سواوە

لە دەستە شێوەی سۆراندا :

خووسا ـ خووسای ⟵ نۆکی خووسایەوە
هات ـ هاتیی ⟵ ساڵی ـ هاتیی ـ
هات ـ هاتیی ⟵ میوانی هاتیی •

**دووەم :**

نموونەی ئاوەڵناوی بەرکار :

خوێنرا ـ خوێنراو ⟵ کتێبی خوێنراو = مدروس
خوێنرا ـ خوێنراو ⟵ کتێبی خوێنراوە = مقروء

شۆرا ـ شۆراو ⟵ پیاڵەی شۆراو
شۆرا ـ شۆراو ⟵ نیسکی شۆراوە

هاڕدرا ـ هاڕدراو ⟵ گەنمی هاڕدراو

هـارِدرا ــ هارِدراو ⟵ کلی هارِاوە ( هارِدراوە ) •

گیــرا ــ گیــراو ⟵ دزی گیراو
گیــرا ــ گیــراو ⟵ دەرمانی گیراوە

سوورکرا ــ سوورکراو ⟵ خەرمانی سووڕکراو

⟵ گۆشتی سوورکراوە
⟵ گۆشتی سوورەوەکراو

لە ســۆرانیدا :

نووسرا ــ نووسرای ⟵ کتێبی نووسرایەوە
خــورا ــ خــورای ⟵ نانی خورای
شــاردرا ــ شاردرای ⟵ پارەی شاردرایەوە

**مەبەســت :**

لە هەڵکەوتی ئەو فرێزانەوە بە تێرامانەوە دەڵێم : ئەو پاشــــگرە ئەوەندەی بە ساکاری کەوتوەتە بەر زەبری ئەم نووسینو ئەو نووســین ، بەلای منەوە وەك گەردیلە یەکی ئۆرانیۆمە لە زمانەکــــەمــاندا ؛ تا لێی وردبیینەوە هەر لە تەقینەوەدایە !!

وێ دەچێ ماموستا ڕەئوف
ماموستای عیزیا بێ

بەر لە تاوتوو ، ئەم پرسیارە : کە بڵێین ـ منداڵەکە نووســــت ، نووستەوە بۆ دووبارە نووستن •• ئەمەیان راســـتە • کەچی ناگوترێ ـ منداڵی نووستوە = منداڵی نووســـتوەوە ؟ ••• ئایا لە مەدا چ نهێنیەکی زمان هەیە ؟! •

هەر ئەوەندەم بۆ دەلوێ کورتەوەلامێك بدەمەوە :

با لەپێشەوە دیمەنی ( نووستنەوە ) بخەینە بەرچاو ، یەکێك بۆ یەکەم جار دەنوێ ••• دواتر بە ئاگادێ ـ زۆری پێ‌بچێ یان کەم ـ هەمان کار کە

مانەندی پێشویە بەدیی‌دەهێنێ ؛ واتە ـ بۆ جاری دوەم نووستن • ئـەم دوو رووداوانە لێکدی پچڕاون ، تەنها رشتەیەکی زمـانی دەیانکاتەوە بـە مانەندو لەنێوان هەردووکیاندا بۆشاییەکی ـ بێ‌نووستن ـ هەیە ، ئەمەش کارێکی یەك تەکانیەو لە ئاوەڵناودا دەرناکەوێ ، چونکە لایەنی زەمانیـان تێدا دیاردی‌ناکرێ هەر لەبەر ئەمەیە کورد گوتویە :

ـ بەردی شکاو ـ نالێ :ـ بەردی شکاوە ـ •

کەچی دەلێ : ـ بەردی هاڕاوە ـ •

یان نالێ : ـ گەلای شکاو ـ • دەلێ : گەلای شکاوە ؟!

چونکە ئەویان رووداوێکی تەکانیی زەمانیە • ئەمیشیان هەمـــان رەگەکارەو روودانەکەی یەك‌بینەیەو خۆی نابەستێتەوە بە رشـــتەیەکی دیاردیی زمانەوە •• دەرخســـتنی ئەم جۆرە تایبەتانە لە قالبی ئاوەڵناودا سەلیقەی زمان فەراهەمی هێناوە •

پوختەی قسەم :

أ ـ لە دۆخی دووبارەدا ، ئـەو مۆرفێمە نالکێ بـە ئاوەڵناوەوە ، وەك :

ـ دووبارە نووستو ، دیسانەوە هاتو ـ •

ب ـ لە دۆخی کارو رووداوی یەك‌بینەدا ، پێیەوە دەلکێ‌و لەگەڵ وشـــەی تایبەتیدا باشاردەکا ، وەك :ـ

ـ شەرابی گەڕاوە ••• کەشکی سواوە ـ •

ئەم دووحاڵەتە تایبەتن بە رشتەی زەمانەوە ؛ دەنا ئاڵۆزی لـەنێـوان رووداوی جارەکی‌و رووداوی شێنەییدا ، پەیدادەبێ •

**باری لکانو قەبارە :**

١ ـ ئەگەر ئاوەڵناوەکە ، کۆتایی بە بێجگەی ( و ، ی ) دەنگداری وێســــتاو بوو ، تێکڕای مۆرفێمەکە دەردەکەوێ‌و چ ئاڵۆزییەکی تێــدا بەرپانابێ ، وەك :

ـ خوێنــەر ، خوێنــەرەوە = قــاریء ـ یــان چــاوســوورکەر ، چاوسوورکەرەوە ـ • لەمەوبەر لێیانەوەدوام •

٢ ـ ئەگەر کۆتایی بە ( و ) ی وێســـتاو بوو ؛ گەردانێکی تایبەتی هەیە ، بەنموونە :ـ

( سوان ـ سوا ـ سواو + ەوە = دەبێتە : ســواوەوە ) ئەوە بیچمە راستەقینەکەیەتی ، بەپێی گەردان • مەگەر کەسێك تەســەنوعی تێدا بکا ئەگینا ئاوای نابێژێ •• بگرە تەنها بزوێنە بەرایی [ ەوە ] لەکاردایــەو دوو بەشی ( •• وە ) لــەنــاو دەچێ ؛ بەم رەنگە : ( ســــواو + ەوە ـ وە = سواو + ە = ســ •• / وا / وە )[٦٧] واتە بزوێنی « ە » ی پاشــگرەکــە [ ەوە ] ، [ و ] ی ئــاوەڵنــاوەکــەی راپێچکــردوە • بڕگــەی [ وە ] ی دووڕەگ ، لە رواڵەت‌و دەنگدا بە رامەی [ ەوە ] ی ســـــەربە خۆی ، وەرگرتوە ، گومانیش لــەم ئاوێتەیەدا نیــە ؛ چونکە لە هەڵچەرخانــەوەی پاشگرەکەدا ، ( و ) ی ئاوەڵناوەکە وەك خۆی دەمێنێتەوە کە دەگوترێ :

( سوورەوەکراو = سوورکراوە )

ئەم هەڵچەرخانەوە پتر مۆرکی ئەردەڵانی‌و موکریە لە وشـــــەی

---

(٦٧) لە نووســینی رەمەکیداو لە زۆرینەی بەرهەمە زمانی‌و ئەدەبیەکاندا ، دەنووسن :
( سو / وا / وە ) واتە نیمچە بزوێنەکـــە بــە / .. و / ی تــەواو دەشکێننەوە . من ئەمە بەراست نازانم ، ئەگەر مەودا بەو نووسین‌و کۆکردنە بدرێ دەبێ ئەم وشــــــانــەش / ..و / یان تێ‌بترنجێ :
( خو / وا = خ .. / وا ، چو / وار = چوار .... ) .

لێكدراودا ، له ئاخاوتنی سلێمانیشدا خۆی چەسپاندوه • نموونەی دی که بزوێنی بەرایی [ ەوه ] له دوای ئاوەڵناوەوه دەوری تێکرای مۆرفێمەکـه ببینێ :

« بووکی بـەهـــــاری جوانی رازاوه
لـه کوردستاندا خـەیمەی هـەڵداوه »
« کامەران موکری »

٣ ـ ئاوەڵناوی کۆتایی هاتو به ( ی ) وێستاو :ـ

تێکرای [ ەوه ] خۆی تێدا دەردەخاو ( ی ) لەگەڵ ( ە ) ی بەشـــه مۆرفێم دەجوولێ ، وەك :

( نۆکی خووسای + ەوه = خووسایەوه )

**بـاری ئالۆزکان :**

أ ـ له دەستەشێوەی سۆراندا وێنەی ( پسایەوه ، شارایەوه ) کـــه ئاوەڵ ناوبن لەگەڵ وێنەی ( پســـــایەوه ) ی کاری رابوردووی بینراوی جوداوازییان نیه •

ب ـ له دەسته شێوەی سلێمانیشدا ، ئاوەڵناوی ( پساوه ، شکاوه ) له رابوردووی نزیك هەڵناهاوێردرێن ؟!!

بۆ چارەسەریی ئەو تێچرانه روالەتیه دوو شـــێواز رەچاودەکرێ‌و دیاردەیەکی گشتین له زماندا :ـ

١ ـ بەپێی هەڵکەوتی رسته •

٢ ـ به قورسه دەنگ ، به لێدانەوەیەکی‌که هێزەدەنگ = ئاکسان •

ـــ کـه گوتمان : ( لقی شکاوەمان •••• ) لـه دەربازگەی کاردا نابێ‌و فرێزێکی ئیزافیه • هەرچەنده له ئاخاوتنه سۆرانیەکەدا سەبارەت بـه

دەنگی [ یـ ] پێش مۆرفێمەکە پتر بەرامەی کاری لێدێ ؛ چونکە هەمان دەنگ زەین بەرەو دۆخی راناوی ، دەترازێنێ .

ــ له هەردوو قاڵبدا ـ کە کارین ـ قورسە دەنگ دەچێتە سـەر بڕگەی پێش « یە » لە سۆرانیداو دەچێتە سەر پێش « وە » لـە بابانیدا . ئاوەڵ ناویش بن دەچێتە سەر دوابڕگە .

دیاردیکردنی قورسە دەنگ ، لـە بێژاندا ئاسانـەو هەرناوچەیە لـە کرکەی خۆیـدا جۆرە راهتنێکی هەیە کـە نـاوچەیـەکیدی نـاتـوانێ لاسایی‌بکاتەوە . لە نووسینیشدا سەربە خاڵبەندیەو پەیوەندیی بە نایاب بێژیەوە هەیە ؛ لایەنێك نیە کە بەگرامەر داببن‌بکرێ .

زۆر بەجێیە کە لەبرێ زمانداو لە نێوان دۆخـە هاوبەشـەکاندا ( الحالات المشتركة ) بـە توخمێکی سـەرەکی داناتێن لـە کەرەسـەی رێزمانـدا .

**ئـەم پرسـیارە :**

ئەوا ئاشکرایەکە لە سـۆرانیەکەدا تێکڕای مۆرفێمەکە لە وێنـەی ( شاردرایەوە ) دا ، کە ئاوەڵناوە ، خۆی پاراستوە .. ئەی لە بابانیەکەدا چ بەرهەڵستێك هەیە کە بەتەواوی بێتەکار ؟ ...

گریمان گوتمان ( نۆکی خووساوەوە ) ، بەتاوی گەردانو دەستوور راستە . بەڵام کە لچولێو پێی رانەهاتبێ ، دەستوورەکەش نەزۆكدەبێ .

دیسان ئەو رانەهاتنەش پەیوەندیی بە نهێنیەکی زمانەوە هەیە ؟!..
کەواتە بۆ باری سەرنج :ـ ئەوا توانیمان بە دەستوور خۆمان بـە ( نۆکی خوو ساوەوە ) رابهێنین ، بەڵام لەو حەلەدا کە بەرەنگاری پاشکۆ ئامرازی [ ەوە / وە ] یان پاشکۆی راناوی ئیشـاری لـە هەمان قاڵبی [ وە ] دا ، دەبێ ـ لەوانەیە لچولێو بەدەم تەنافە « امقمی » بڕگەیەکی سـەمەرەوە بتەزێ ، وەك بڵێین : « لە دەربڕینی قسەیەکی شارا وەوە ... وە ، تووش‌بووم » .

## — ٣ —

# نیشانەی کاری رابوردووی نزیك
# لە ئاخاوتنی سلێمانیدا

لە قۆناغی یەکەمدا ( بەشی ڕەخنە ) لە دوو ڕای جیاوازم کۆڵیەوە هەریەکەیان لە گۆشە نیگای خۆیەوە جۆرە حیسابێکی بۆ تاقە پیتێکی نیشانەکە کردبوو .. بەبێ هیچ ئاوڕدانەوە لە کەرتەکەی دیکەیان . لێرەداو بە ڕێگەیەکی بەرەنجامی ئاسا دەکەومە سووسەی ئەنجامێکی گونجاو لەگەڵ وشەسازیی زمانەکەماندا .

[ گەردان ]

١ - تێنەپەڕ :

| أ رابوردووی رەبەق | | رابوردووی نزیك |
|---|---|---|
| هاتم | ( م ) | هات + و = وو + م |
| هات | ( .. ) | هات + وە |
| هاتن | ( ن ) | هات + و + ن |

٢ - تێپەڕی کارادیار لەگەڵ بەرکاری تاکدا :

| أ ـ کار | راناوی کارا | ب ڕێژگەی کار | راناو ، نیشانە |
|---|---|---|---|
| نانم خوارد | ـ م ـ | نان + م خوارد + وە ⟵ ../وە | |
| خواردم | ـ م ـ | خوارد + و ... ە ⟵ م / و ... ە | |
| خواردی | ـ ی ـ | خوارد + و .... ە ⟵ یـ / و...ە | |

| | | |
|---|---|---|
| خواردیان | ـ یان ـ | خوارد + و ... ه ⟵ یان / و...ه |
| خواردی | ـ ی ـ | خوارد + و ... ه + ت + ی .... ؟ |
| خواردی | ـ ی ـ | خوارد + و یێـ = یه + ت + ی .. ؟ |

٣ ـ لەگەڵ بەرکاری کۆدا :

| أ ـ رابوردووی رەبەق | راناوی کارا | راناوی بەرکار |
|---|---|---|
| نانەکانم خواردن | ـمـ لەگەڵ بەرکاردا | [ن] بە دوای کاردا |
| خواردمن | ـمـ لەبەرەوە | [ن] بە یەکەوە |
| خواردنی | ـیـ لەدواوە | [ن] لە پێشەوە |
| خواردیانن | ـیانـ لەپێشەوە | [ن] بە دوایەوە |

| ب ـ رابوردووی نزیك | راناوی کارا | راناوی بەرکار |
|---|---|---|
| نانەکانم خواردون | ـمـ لەگەل بەرکاردا | [ن] بە دوای کارەوە |
| .. خواردومن | ـ م ـ | [ن] بە یەکەوە |
| .. خواردویانن | ـ یان ـ | [ن] |
| .. خواردونی | ـ ی ـ | [ن] بە پێچەوانەوە |

٤ ـ رابوردووی کارابزر :

| أ ـ بۆ رەبەق | ب ـ بۆ نزیك |
|---|---|
| کوژرا + م | کوژرا + و + م |
| کوژرا + ن | کوژرا + و + ن |
| کوژرا ( .. ) | کوژرا ( .. ) + وە |

**راڤــەو لێکۆڵینەوە :**

نیشانەی کاری رابوردووی نزیك بە دوای تێنەپەڕەوە ، کــە کۆتایی بە دەنـگداربێ :

لە مەرجێکدا کە بۆ ســــێیەمی تاكبێ ، لە بــەر ئەوەیکە رانـاوی لەتەکدانیە ، تێکڕای نیشـــانەکە دەردەکەوێ •• وەك : ( هات + وە = Hati we ) •

لەگەڵ راناوی کاراداو لە دەستە شــێوەکانی شارباژێڕو موکریدا ، تەنها بەشێکی نیشانەکە [ و ] خۆی دەپارێزێو بزوێنەکەی « ە » تێدەچێ ، وەك :

( هاتـ + و + م = Hatûm )[٦٨] لەم حەلەدا بزوێنی « و » بە درێژی گۆدەکرێ • ـ ئەگەر کارەکە کۆتایی بە بزوێنی « و » بوو ، وەك ـ چوو ـ کە بۆ سێیەمی تاکە ، بە هەمان دەستووری پێشوو بەم چەشـــنە گەردانی پێ دەکرێ ـ چوو / وە ، لەبەر ئەوەیکە ( وە ) ی نیشـــــانە بڕگەیەکی ســــەربەخۆیە ، رێگە لە درێژیو کورتیی بزوێنی پێشخۆی ناگرێ •• بەڵام لە گۆکردنی هەرێمەکەدا ، دوو قاڵب سەقامگیربووە :

١ ـ چو / وە ـ نەك : چوو وە •

٢ ـ چوە = چ •• / وە •

بــەڵام بێتو هــەمــان کــار : ( چوو ) کـــە رانـاوی پێوەبلکێ وەك ( چو+و = نیشانە+ن= ) لەسەر هاوکێشەی ( هاتـ + و + ن = )

---

(٦٨) و ـ ی بەشە نیشانەکە لە خۆیدا دەنگدارە وەك : نووسراوە ، هاتوە . کە بزوێنەکەی لێبپسێتەوە ، یــان لەگــەڵ دەنگداردابێ دەبێتەوە بــە بزوێنو بەدرێژی گۆدەکرێو پەیوەندی بە باری دەنگسازیەوە هەیە ، وەك : هاتووم ، هاتوومە / تەوە . بەڵام بەشبەخۆم بە جووتە (..وو) نایننووسم . لە بەحســـەکەمدا ( دواوانێــك بۆ رێنووسی کوردی ) هویەکەیم روونکردوەتەوە .

یەکێ لە جووتەواو تێدەچێو جیاوازیناکرێ لە نێوان رابوردووی رەبەقو نزیکدا •

بەڵام لە ئاخاوتنی کرمانجیی سەروو وسۆرانو هەندێ ناوچەی گەرمیاندا ( خانەقین ) دەست بەرداری بزوێنەکەی نابن و ئاڵۆزە زمانیەکە پەیدا نابێ ، وەك : ( چوومە ، چوونە ) •

أ ـ لەگەڵ تێپەڕدا کە بەرکاری تاکی لەگەڵدابێ :

نانێکم خوارد ⟵ ••• خواردومە •

لەم دۆخەدا کە بەرکارە تاکەکە دەرنەبڕدرێ بۆ رەبەق دەگوترێ : ( خوارد + م ) بۆ نزیکیش ( خوارد + و مـ ە ) راناوی کارا نێوباخەڵی نیشانەکە دەبێ : ( و ••• ە ) •

لە بەشە رەخنەی ئەم بەحسەمدا لەو رایەم کۆڵیەوە کە گوایە بزوێنی « ە » ی دوای ـ خواردومە ـ راناوی بەرکارە • بەلامەوە بۆچوونێکی نەگونجاوە •

لەم حەلەدا کە کارە تێپەڕەکە لەسەر بەرکاری تاك بێ پێویستە بەراوردی رەبەقو نزیك بکەین : لەوێنەی ـ نانم خوارد ، خواردم ، دا راناوی بەرکار نیە ، کەواتە بۆچی لەوێنەی ( نانم خواردوە ، خواردومە )دا بزوینەکە بکرێتە راناوی بەرکارو ، واوی خواردوەش بکرێ بە پاشگری ئاوەڵناو ؟! •

ب ـ نانێکی خواردوە ⟵ خواردویە ـ •

لەم قاڵبەدا بە هەمان شیکردنەوەی ( خوارد + و + مـ + ە ) راناوی کارا بۆ سێیەمی تاك کەوتوەتە نێوان دوو کەرتەی نیشانەکەوە •• ئەمە وێژگەیەکی ئاساییەو تووشی فەلاکەتمان ناکا • بەڵام لاری لەوەدا نیە کە

دەگوترێ : ( نووســــیویە ، نووســـــیویەتی ) یـــان ( خواردویـــە ، خواردویەتی ... ) .

ساختمانی کارەکە بەم چەشــــنە هەڵکەوتوە : ( یـ ) پێش بزوێنەکە راناوی کارایە و بۆ کەسی سێیەمی تاکە ، بە بەڵگەی دەرکەوتنی کە لەگەڵ بەرکارەکەدابێ ، وەك ( نانی خواردوە ) ( ی ) کۆتاییش راناوی بەرکارە لە قاڵبی تاکداو دەبێتە : ( خوارد + و + یـ + ە + ی ) بۆ نێوبڕی‌ی جووتە بزوێنەکە دەنگی [ ت ] سازاوە ، ئەم رێژگەیە سەربە دەستووری گشـــتی نیە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە نهێنییەکی زمانەکەمانە تا ئێستا لـە لێکۆڵینەوەدا بێ‌ناز بووەو بەڵگەیەکی بەهێزە کە تێکڕای نیشانەکە [ وە ] یەو بزوێنەکەی واتە « ە » راناوی بەرکارنیە ، دەنا دوو رانـــاوی بەرکـــار لە دۆخی تـــاكو بەدوو روخساری بزوێن کۆدەبنەوە و ئەمەش لە رشتەی ئەم زمانەدا نیە !!

کە راناوە کارایەکە کۆبێ‌و بەرکار تاكبێ لەسەر ئەو دەســــتوورە ســــازنابێ ، بە نموونە : ( ئازادو نەوزاد نانەکەیان خواردوە ) ناگوترێ : ( ئەوان خواردویانە ی .. یان خواردویانەتی ) .

سەیر لەوەدایە کە راناوە کاراکە کۆبێ‌و بەرکار تاكبێ‌و بۆ دوەم کەسی تاكبێ ، بە پێچەوانە جووتە دەبەســـــتن ، وەك : ئازادو نـەوزاد تۆیان گرتوە ـ دەبێتە ( گرتویانی ) .

دواتر ســـــەرنجی خشـــتەی ســـەرەوە بدەینەوە : کە راناوی کاراو بەرکار کۆبوونەوە ، بەرکار دەکەوتە دواوە . وەك : خواردمن ، خواردتانن خواردویانن ، خواردومن ... هتد .

کەچی کـە بەرکار کۆبێ‌و کـارا تـاكبێ‌و بۆ ســــێیەم کەس ، بـە پێچەوانەوە جووتە دەبەستن ، وەك ( خواردونی ) راناوی ( ن ) بەرکـــار هەڵچەرخاوەتەوەو ( ی ) کارا ، لە دواوەیە !!

هیچ رشتەیەکی زمان بێ نهێنیو سرِ نیە ، زمانەوانیش تەنها رواڵەت ڕیزکردنو وەستایەتی نیە ، با سەرنجێکی هەمان ڕێژگە بدەینەوەو راناوی کارا بخەینەوە پێشەوە وەك لە دۆخەکانی دیدا ، ئەوسا دەبێتە ( خواردونی = خواردوین ) لەم حەلەدا ، دەبێتە راناوی دوەم کەسی کۆ ، بە دوای ناو و ئاوەڵناوەوە ، وەك : « ئێمە گورگان خواردوین » !؟! •

**پوختەی بۆچوونم :**

١ ـ تێکرِای نیشانەکە بریتیە لە فۆرمی [ وە ] •

٢ ـ لە هەندێ باردا دەستبەرداری بزوێنەکەی دەبێ •

٣ ـ لەگەڵ تێپەڕداو بەبێ راناوی بەرکار دەپسێتەوەو راناوەکە نێوخۆی دەگرێ •

٤ ـ لەگەڵ ئەو کارەدا کە کۆتایی بە / •• وو / ی درێژە ، کورتی هەڵدەهێنێتەوە ، وەك ( بووە )(٦٩) •

٥ ـ ئەگەر پێشەوەی دەنگداربوو ، بە دوای نیمچە بزوێن نەك ( و ) نێوبەست ، خۆی ساغ دەکاتەوە •

٦ ـ لەگەڵ ئەو رایانەدا نەبووم کە نیشانەکەیان ناوناوە پاشگرو دواتر بەسێ فۆرم تاویانداوە کە ئەمانە بوون : ( ـ ە ، وە ، ووە ، و ••)•

٧ ـ قاڵبی « •• ووە » بەهیچ زانستێکی زمان حەلێبی بۆ ناکرێ ، قەت دوو بزوێنی دژ ، وێکرِا دەنگ ، کێش ناکەن •••

٨ ـ ئەگەر کارەکە کۆتایی بە [ •• وو ] ی درێژبوو ، چ بەرهەڵستێك نیە چونکە نیشانەکە خۆی بەرگەی سەربەخۆیە ، وەك گوتم :

---

(٦٩) لەم شیعرەی مەحویدا / ..وو / ی پێش نیشانەکە بە تەوای تێ دەچێ :

« رەحمو مرووەتت نەبوەو نیشە باخسوس
دەرحەق بە عاشقانو لە دەرحەقمنا خوسوس »

بە [ ٠٠ و + ] کورت هەڵدێو راستە ، وەك :

« قەت ـ بووە دڵبەری مە جارێ لەمە یادنەکا

بە سەلامێ بە پەیامێ ، دڵی مە شاد نەکا »(٧٠)

نیشـــانەی رابوردووی نزیك لـەگـەڵ

ئامرازی « ە » ی پـەیـوەنـدیـدا ٠٠٠٠

چەند نموونەیەك :

١ ـ رۆیشتوم بۆ ماڵ = رۆیشتومە ماڵێ

رۆیشتومەتە ماڵێ ٠

٢ ـ پارەکانم لە نێو کیسە خستون =

خستومنە نێوی

خستومنەتە نێوی ٠

٣ ـ پارەکەی داوە بە دارا =

پارەکەی داوەتێ

داویەتە دارا ٠

٤ ـ لەم شیعرەی نالیدا :

« وەك قەفەس ئەم حوجرە کونێیە کەوا گرتومیەناو

تاروپۆیی عـەنکەبوتـە ، زۆرە لێی کـردومـە داو »

✻ دەقی ئەو رستەو میسالانە ، چۆن لە زمانی قسەدا لە کاردان لە نووسینیشدا بە دەستوورێکی تایبەتیو بە بارێکدا دابین نەکراون ٠٠ واتە

(٧٠) دیوانی میـــــباح ددیوان / لێکۆڵینەوەی دوکتۆر مارف خەزنەدار ، چاپی ١٩٧٠ ل ٢١ ٠

نه چ کاتێکدا بزوێنی نیشـــــانەکە تێدەچێو تێناچێ •• یان لەبەرچی جاربەجار نێوبڕ وەردەگرێ ؟ ••

ئامرازە پەیوەندیەکەش کـە لە فۆرمی بزوێنی [ ە ] دایـە ، لەبەرەی پرپێۆزیشنەو لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی دەوێ ، کە ئایا خودبەســـەرە یان پاشماوەو جێگری ئامرازی کەیە •• وەك : ـ بە ، لە ، بۆ ••• هتد •

مامۆســــــتا تۆفیق وەهبی نیگایـەکی داوەتێ ، کە دەڵێ : « أداة تعلق ( ە ) : سوارەکان گەیشتنەجێ = گەیشتن ئە جێ » •

مەبەستی ئەوەیە کە ئامرازی ناوبراو بریتیە لـــە ســــــــووکەی برگەی [ ئە ] •

بە پێی لێکۆڵینەوەو بەراوردی خۆم لەگەڵ رای مامۆســـتادا نیم • هێنانەکایەی ئـەم ئـامرازە ـ لەئێرەدا ـ بۆ ساغکردنـەوەو هـەڵکـەوتی نیشانەی [ وە ] ی رابوردووی نزیکە •

١ ـ لە رستەی ( رۆیشــتومە ماڵ ) دا ، جووتـە بزوێنی ( ە + ە ) بەرەنگاربوونو یەکێکیان تێچووە •• ئەگەر بەرەو ریژگەی (رۆیشتوم)و بەبێ بزوێن بابدەینەوە ، ئەوا دواپینەی نیشانەکە نەماوە •

ئەگەر بەرەو رستەی ( رۆیشتومەتەماڵ ) ئـاوڕ بدەینـــەوە ، ئـەوا ئامرازدکە لەناو چووە ؛ چونکە دەنگ ( ت ) ی نێوبڕ بۆ پاراســـــتنی هەردووکیانە ، بۆ ئەوەیکە باشـــتر بۆمان دەربکەوێ ، ئەوا نموونەیەکی پێجـگەی رابوردووی نـزیـك دەهێنمەوە ، وەك : ( بچـۆ ) ی کــاری داخوازی •• لە هەمان قاڵبە رستەدا ، دەگوترێ : ( بچۆ + ر + ە ـ ماڵی ئێمە ) واتە : ( بچۆ بۆ ماڵی ئێمە ) • ئەگەر پاراستنی ئامرازەکـە گرنگ نەبوایە رێگە لەوە نەدەگیرا کە بگوترێ : ( بچۆ ماڵی ئێمە ) • هێنـــانی نێوبڕەکە بۆ پاراستنی ئامرازاکەیە •

٢ ـ دیســــان لەگەڵ راناوی بەرکاریشـــــدا بزوێنەکە تیدەچێ‌و تێناچێ •• لەباری تێنـەچـوونــدا ـ بەهۆی تێــوبــڕەوە ـ ئەو رایــە سستدەکاتەوە کــە گوایا [ ن ] لە ( خســـتمن ) دا جێ‌گری [ ه ] ی بەرکارە •• بەڵام کە دەبێژرێ ( خستومنەتە ناو ••• ) بزوێنی نیشانەکـە لەگەڵ راناوە بەرکارەکەدا کۆدەبێتەوەو رێگە لەوە دەبەســـترێ کــە هەردووکیان بە تاك‌وکۆ بەرکاربن بۆ یەك شت •

٣ ـ سەختی لەوەدایە کە لە هەندێ رســتەدا راناو دەبێتــە جێ‌گری ئەو ناوەی ئامرازەکەی لە پێشەوەیە ، ئــەو تێدەچێ‌و تێوبڕەکــە تێکڕای نیشانەکە دەپارێزی ، وەك : ( پارەکەی داوەتێ ) لەم رستەیەدا ( ی ) دوای ( پارەکە ) راناوی کارایە •• ماوەتــەوە ( ێ )ی دوایینــە ، لــە هەڵکەوتی رستەکەدا بۆنی راناوی بەرکاری لێ‌دێ ، واتە : ( پارەکەی داوەتە دارا ) ؟

ئــەم کارە ســەرناگرێ‌و قاڵبــە رســتەیەکی‌دی دەبێتە بەرهەڵســتی ، کە بڵێین :

( بلە پارەکەی داوەبە داراو زارا = ←←←← پارەکــەی داونــەتێ ) •
ئاشکرایە کە ( ن ) راناوی بەرکارەو دەگەڕێتەوە بۆ داراو زارا •• ( ێ ) لە هەمان کاتدا نابێتە جێ‌گری ئەوان !!

دەنگی ( ت ) تێوبڕی جووتە بزوێنی ( ە ـ ێ ) یە • قوتبوونەوەی ئەم ( ێ ) یەش بێ‌سەبارەت نیە ؟!

ـــ ئەگەر بڵێین لارەدەنگی بزوێنی « ە » یەو رســـــــتەکە بـەم چەشنە بووە : ( پارەکەی داونەتە ) ، تایبەتی ئامرازەکە رێگە نادا ؛ چونکە بۆ جۆش‌دانە لە تێوان رستەدا • من وای بۆ دەچم کە پاش‌ماوەی (پێ) بێ‌و رستەکە بەم چەشنە بووبێ : ( پارەکــــەی داوە پێیان ) یــان ( پارەکــەی پێ‌داون ) ئنجا گۆڕانی بەسەردا هاتبێ‌و بووبێتە :

( پارەکەی داونەتێ ) •

دوای ئەوە بە راناوی انتقالی ناو دەبرێ یان بە هەر شتێکی دیکە لەو بابەتانە ، هیچ لە باری مەسلەکە ناگورێ •

**بـڕیـار :**

دوای ئەو لێکۆڵینەوەیە کورتـەی قســـەم ئەوەیـە : رشــــتەی ( خستومنەتەناو ••• چوومەتە ماڵ ••• ) سەربە دەستوورێکی بێ گرفتەو کوردی واتەنیشەو نیشانەو ئامرازەکە وێکرا پارێزراون ، ماوەتەوە ئەوە کە لە زمانی نووسیندا پەیڕەو بکرێ و لەسەری پێك بێین •



## — ٤ —

## پاشگرەکەو نیشانەکە بەیەکەوە

أ ـ

« رێیـەکی وامـان نەدیـوەتـەوە
ســـەرکەوتنی لێ بوەشـــێتەوە »
« پیرەمێرد »

١ ـ نەدی + وە + تـ + ەوە
٢ ـ هات + وە + تـ + ەوە
٣ ـ هاڕی + وە + تـ + ەوە

ب ـ ١ ـ هات + و مـ + ەوە = هاتومەوە •
٢ ـ هات + و مـ ە + ت + ەوە •

٣ ـ نووسی + و یـ ە + تـ + یـ + ەوە •

ج ـ گەڕا + وە + ت + ەوە + انێ •

د ـ گەیشتـ + وە + تـ + ەوە + ماڵ ••• ەوە •

ـــ گەیشتـ + وە + تـ + ەوە + ە ـ ماڵ + ەوە •

هـ ـ لاڵا + وە + تـ + ەوە = لاڵاوەتەوە •

ـــ پاڕا + و مـ ە + تـ + ەوە(٧١) •

**داخزانێك :**

لەو کارانەدا کە تێکڕای نیشانەی [ وە ] یان پێوەیە ، پاشـــــــگری [ ەوە ] خۆی پاراســـــــتوە ، بە دەنگی ( ت ) جووتـە بزوێنی [ ە + ە ] تێوبڕبوون •• لەو شێوە ئاخاوتنەدا ، زمانەکە خۆی فەراهـــەمی هێناوەو لەمەرجێکدا تێوبڕ نەبێو یەکێکیان تێبچێو بڵێین :

( هاتوە وە ) نە لچولێو سەغڵەتدەبێو نـە ئاڵۆزکانیش پەیدادەبێ •

ئەو رایانەش پووچدەکاتەوە کە گوایە بزوێنە بەرایی پاشـــــــگرەکە بۆ تێوبەستی جووتە بڕگەیە •

---

(٧١) بە نەوازشەوە ، دەڵێم :

تا ئێستا جووتە مۆرفێمی ناوبراو ، بەو شـــێوەیە بووژانەوەیان بــە خۆیانەوە نەدیوە . بگرە نیشـــانەی رابوردووی نزیك ، دڵێکە لـــە هەیکەلی زمانەکەماندا بە هەموو شـــێوەو دەســـــتە شێوەیەکیەوە ، تا ئێســـتا ئەو پەڕی بێنازیی بـــە خۆیەوە دیوە . هۆیەکـــەشی دەگەڕێتەوە بۆ هەژاریمان لە لێکۆڵینەوەی زماندا ....

بڵێین پسپۆڕانی زمانمان نین ، راســـــت نیە .. بەڵام بێدەرەتانیو سڵەمینەوەی خوێندەوارەکانمان لە بەرهەمی زانســـــتەزمانیەکان ، کۆسپەو زمانەوان لەگەل دەخا ، مەودای بیرکردنەوەشمان ئەوەی بۆ رەخساوە .

ــ ئـەو کارەی کـە کۆتایی بە راناوی کـارایـە ، وەك ( هاتوم ) بزوێنی نیشانەکە نەماوە ، لە کاتی لکانی پاشگرەکەدا ، جار هەیە زینـدوو دێتەوە ، وەك ( هاتومەوە ) چونکی [ و ] ی بەشە نیشـانە دەوری خۆی دەبینێ •• لەگەڵ ئەوەشدا بە تاوی پاشگرەکەو بۆ باری دابینیو یەکسانی، زەقدەبێتەوەو دەگوترێ ( هاتومەتەوە ، چاك بوویتە تەوە ) بە هەمـــان دەستوور کە لەگەڵ راناوی بەرکاریشدابێ ، وەك : ( گرتومنەتەوە ) •

لەبارێکدا تێپەڕبێو بۆ کەسی سێیەمبێ جووتە بزوێن دەپارێزرێن ، وەك ( نووسیویەتیەوە ) یان ( نووســـــیونیەتیەوە ••• ) چونکە لـــەم رێژگەیەدا راناوی کارا دەکەوێتە دوای راناوی بەرکارەوە •

ــ هەر وەك چۆن کارەکە رەبەقبێ ، زێدەی ( انێ ) ی پێوە بەند دەبوو ، لەبارێکدا نیشانەی نزیکیشی پێوەبێ رێگە ناگرێ •

ــ لەو شوێنانەدا کە پاشگرو نیشانەکان لەگەڵ « ە » ی ئامرازدا جەڵە دەبن ، ئامرازەکە ناپارێزرێ ؛ چونکە روخســارەکە تێکناچێو جگە لەوەش یێتو زەقبێتەوە دەبێ ، نێوبرەکەی خۆی بۆ بهێنرێتەوەو قەتـارە برگەیەك پەیدادەبێ ، وەك بڵێین : ( هاتومە تەوە تە ماڵەوە ) بە یاســـای ( گەیشتمە ماڵەوە ) سەلیقەی زمانەکە ئەوەی قبووڵنەکردوە ، کەچی کـە تەنها نیشانەکەی رەگەڵ بکەوێ ، ئامرازەکەش بە نێوبڕ خۆی دەسازێنێ و بە زولاڵی دەگوترێ : ( هاتوەتە ماڵێ ) •

ــ ئەو قەدە چاوگانەیکە بەبێ پاشگری [ ەوە ] گەردانناکـەن ، بە تەنێ نیشـــانەکە وەرناگرن وەك : ( لالآن ـ لالآ ، پـاڕان ـ پاڕا ) بۆ رابوردووی نزیك نابێژرێ ( پاڕاوە ) بەلآم کە بە پاشگرەکە شـــەحنبوو ئنجا بە نێوبڕەوە دەکەوێتە گەردان ، وەك :

( لالآ + وە تـ + ەوە ، پاڕا + وە + تـ + ەوە ) •

لەمەدا نهێنییەکی زمان سەرهەڵدەدا ؛ کە نیشـــــانەی نزیك کاتێك ڕوودانەکە دەگێڕێتەوە = نەقڵیدەکا ـ حەدەسەکەی تێدا نمایانبێ[٧٢] •

**ئـەنجـام :**

١ ـ نیشانەو پاشگرەکە ، ئەگـەر بەرەنگاری « ە » ی ئـامـراز بوون ، ئەمیان تێ دەچێ •

٢ ـ کە نیشانەکە راناوی تێو خۆی گرتو لەگەڵ پاشـــــــگرەکەدا ، بزوینەکەی تێدەچێو تێناچێ •

٣ ـ لە رووی دەستوورەوە لایەنی پاراستنەکەی راستە •





٭ پاشـــــکۆ ( ملحق ) ئامرازی پەیوەندی لە روخســـــاری [ ەوە ] دا[٧٣] •

تێهەڵکێشی ئەم پاشکۆ ئامرازە لەگەڵ نیشانەو پاشگرەکە ، تەنهـــا

(٧٢) ئەگەر بۆباری سەرنجیش بێ ، نۆبەرەیەکە لـــە بیری خۆمو زادەی بەکێکیدیکە نیە .

(٧٣) رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ( ل ٣٢٢ ، ٣٢٣ ) پێی دەڵێ :ـ
تەواوکەری پریپۆزیشنی « لە ، بە » بۆ ئەم مەبەستانە :
١ ـ راگەیاندنی سەرەتا ـ لەماڵەوە دەچمبۆ ....
٢ ـ راگەیاندنی ( ظرفیة ) لەلای تۆوە دانیشتم .
لەگەڵ « بە » دا بۆ ئەم مەبەستانە :ـ
١ ـ مصاحبە ـ نانەکەم بە دۆوە خوارد .
٢ ـ بۆ حاڵەت ـ چایەکەم بە پێوە خواردەوە .
دیسان لیژنە ـ ل ٣١٤ ـ دەڵێ :
روونکردنەوەی هۆی بەکارهێنانی ـ تـەواوکـەری ـ لەگـەڵ هەندێ پریپۆزیشن ، وەك : ( لەمنەوە ... ) خـــتە کاتێکی تر .

ئەبەر ئەوەیەکە هاو فۆرمیانە • ئەگینا ئەمیان پەیوەندیی بە رستەسازیەوە هەیە •• ئەگەر بابەتیانەش قووڵی نەکەمەوە ، بێدەنگەی لێناکەمو ئەویش عەلایەکی کەیە لە یەکبوونی زمانەکـەمانـدا • جگە لەوەش کــە هەندێ زمانەوان لەگەڵ [ ەوە ] ی پاشگردا بە یەکیان زانیون !!

لە کرمانجیی خوارووا ، بە دوو فۆرم دەردەکەوێ : [ ەوە/وە ] • ە هەندێ هەرێمی گۆراندا نەك وەك پاشکۆی [ لە ، بە ] بگرە لە باتی ئەو پرپیۆزیشنانەو لە روخساری ( وە ) دا خۆی دەسازێنێ ، وەك :

١ ـ وە = لەناو :ـ وەشار کەرکووك هاتگە سە دنیا •

٢ ـ وە = بە :ـ بووگم وە مامۆستا •

٣ ـ وە = لـە :ـ وە منالیەوە چیمە قوتابخانە •

٤ ـ وە = ە ـ ی پەیوەندی :ـ کەفتم وە زیللەت = کەوتمە ••••

٥ ـ وە = لەگەڵ(٧٤) :ـ

« جەنازەی حوســەین وە عەلی ئەکبەر
وە تازە عەرووس ، قاسـم نەوجەوان »

ــ بە فۆرمی [ وە ] لەگەڵ هەندێ پرپیۆزیشندا روخســـارێکی دارێژراو دەســازێنێ چونکە ســەربە وشـەســازی دەبێ ، وەك لــە : ( تێوەچوون ، پێوەبوون ••• دا ) • بەلام سەربە خۆ ، شییانبکەینــەوە دەبنە گرێی ئاوەڵکار ، وەك ( پێیەوەچوو ) •

ــ بە تێکڕای [ ەوە ] دەردەکەوێ کە بلکێ بە دەنگدارەوە ، وەك : لە ماڵەوە ••• یان لەم شیعرەدا :

---

(٧٤) دیوانی مــەلا خضر مەندەلاوی « پڕ وە خویـن » بەشـــی یــەکـەم ، چاپی ١٩٧١ •

« لـه پشـــت پەردەوە گفتوگۆمانـە
ئـەو پـەردە لاچێ کەســمان نامێنێ »
« خەیام »

بە هەمان فۆرم دەبێتە پاشکۆی « ە » ی ئامرازی پەیوەندی ، وەك :
« نەورۆز بوو ئاگرێکی وای خستە جەرگەوە » •

ـــ ئەمیش وەك پاشگرەکەو بۆ تابینـــا ، زێدەی ( انێ ) ی پێوە دەلکێ ، وەك : ( لە بنەوانێ ••• بە فەخرەوانێ ••• ) •

---

**ئەم پاشکۆیە لەگەڵ مۆرفێمی دووبارەدا :**

١ ـ کـــە مۆرفێمە دووبـارەکـــە هـەڵچەرخێتـەوە ؛ وەك :
( گۆشتی ســـوورەوەکراو ← بە گۆشتی سوورەوەکراوەوە ••• ) لەو دەستەواژەیەدا تێکڕای هەردووکیان بە فۆرمی [ ەوە ] یە •

٢ ـ لە هەمان قاڵبە رستەدا ، مۆرفێمەکە وەك پاشـــگر بمێنێتەوە ، گۆڕاتێکی تەواو پەیدادەبێ ، وەك :

( بە گۆشتی سوورکراو + ەوە + ەوە ••• ) بگوترێو نەگوترێ ، باری پێکهاتنی بەو چەشنە بووە • لایەنە دەنگسازیەکەی ئەم گەردانەی بەسەردا دەهێنێ :

بەچاو پاشگرەکەوە تەنها « ە » ی بەرایی دەمێنێتەوە و لەگەڵ «و»ی ئاوەڵ ناوەکەدا ، روخسارە بڕگەی ( وە ) سازدەدا ، پاشکۆ ئامرازەکەش تـەنهـا بزوێنـــە بەراییـەکـەی تێدەچێو دەگوترێ [ بـە گۆشـــــتی سوورکراوە وە ••• ] •

٣ ـ كە وشەكە كۆتايی بە « و » نەبوو ، وەك : ( خولانەوە ) • لەم حەڵەدا ، پاشگرەكە بە تەواوی دەمێنێتەوە و بزوێنە بەرایی پاشكۆئامرازەكە تێدەچێ وەك : ( لە خولانەوە / وە ، گێژبووم ) •

٤ ـ ئەگەر وشەكە كۆتایی بە نیشانەی شوناس « ەكە » بوو دەبێ چۆن خۆی دابڕێژێ ؟ ••• وەك :

( لە ڕۆژی نانكردنەوە + ەكە + ەوە ••• ) •

لە دوو شوێنی ئێرەدا ، جووتـــە بزوێنی ( ە + ە ) بەرەنگاربوون و گۆناكرێن‌و تێوبڕیش نەسازاوە • بەوە چاركراوە كە بزوێنە بەرایی (ەكە) و پشكۆكە ، لابراون‌و دەگوترێ : ( لە نانكردنەوەكەوە ••• ) •

٥ ـ بەراوردێكی ئەو قاڵبانە كە بكەونە تەك راناوی ئیشـــــارەوەو ئەوەكەش لە دۆخی ئاوەڵناوی ئیشارەدابێ :

ـــ ئەو ••• بەرد •• ە ، ئەم قسە •• یـ •• ە • یان ـ لە ئـەو قسە + یـ •• ـ ە + ەوە ⟵ لەو قسەیەوە •

بۆ پاراستنی بزوێنە ترازاوەكەی راناوە ئیشـــاریەكە تێوبڕی ( یـ ) دێتەكارو بزوێنە بەرایی پاشكۆ ئامرازەكە تێدەچێ ، وەك :ـ

أ ـ ئەوە ⟵ لاساپانكەرەوە + یـ + ە ـ(٧٥) كە بۆ گوزارەی تەواوبێ •

ب ـ لەباری وەسفدا :

( ئەو لاساپانكەر ەوە + یـ + ە ⟵ دزێوە ) •

---

(٧٥) لە نموونەی ( أ ) دا ، دوابزوێنی رســـتەكە « ە » بەلای هەندێكەوە كاری یاریدەدەرەو بەلای هەندێكەوە ، جۆرە راناوێكی تایبەتیە ، لـە نموونەكانی دواتردا ، پساوەی راناو ئیشاریەكەیە بەهەمان روخسارو نێوبڕەوە .

ج ـ بەهەمان دارِشتن و لەگەڵ پاشـــــــکۆ ئامرازەکەداو بە حەلێبی وشەسازیو گەردانی بنەرەتی ، بەم شێوە زەقدەبێتەوە :

« لـە ئـەو ••• لاسـاپانکەر + ەوە + یـ ••• ە + ەوە =

لـە ئـەو لاسـاپانکەرەوەیەوە ← ترسـام » •

لێرەدا سێ مۆرفێم قەتارەی بەستوە :

١ ـ ەوە ـ ی پاشگری دووبارە •

٢ ـ ە ـ ی پساوەی راناوی ئیشاری •

٣ ـ ەوە ـ ی پاشکۆ پریپۆزیشن •

باری دەنگسازی وای رەخساندوەکە بزوێنە ئیشـــاریەکە بە تێوبڕی « یـ » بپارێزێو بزوێنە بەرایی پاشکۆکەش تێبچێ •





**روخساری مۆرفێمی دووبارە :**

ــ بە پاشگرایەتی‌و بە دوای دەنگدارەوە لەم دوو دەستە شێوەیەشدا بە تێکڕای [ ەوە ] دەردەبڕدرێ ، وەك :

« بە پەلە هات لەو لاوە

لە قەری کردەوە سەلاوە » (١)

« تحفەء مظفریە »

ــ لەگەڵ وشەی لێكدراودا بە هەمان روخسارە ، جا وشەکە کاربێ یان بێجگەی کاربێ •

ــ وەك پاشگر بەدوای بزوێنەوە : بۆم دەرکەوتوە ، ئەدەبیاتی دێرین‌و نوێی هەرێمی موکریدا ، پاشگری دووبارە لە قەبارەی [ وە ] دا ، تایبەتی ئاخاوتنەکەیەتی •

دیسان لە زمانی قسەو گۆرانیی تۆمارکراویاندا کەوتمە سۆراخ‌و خۆشم ـ بەپێی زایینگەم ـ لە قسەکردندا بە ئەوێ کاریگەرم •

ئەو دیاردەیە رێگەی لەوە نەگرتوە کە بە تێکڕای [ ەوە ] و لەگەڵ بزوێندا دەرنەبڕدرێ بە نموونە :ــ

« لێم بووە بە قەسرێکی جندیە ،
خـــەم خـواری دەبـڕییـەوە »

« تحفەء مظفریە » ب١ ل٢٠٣

کە لکا بەبزوێنەوە ـ بە دەگمەن نەبێ ـ تێوبڕ وەرناگرێ و بزوێنە بەرابیەکەی تێدەچێ • بە نموونە :

١ ـ بەدوای / •• و / دا :ـ

بۆ وە = بوو + ەوە = بوەوە •

سوانەوەی ئەو قالبەکارە تایبەتی ئەو هەرێمەیەو لە زمانی نووسینماندا خۆی داڕشتوە ، وەك لە بنەی یەکەمدا شیمکردەوە ، کارێکی سەخت پەیدا دەکا لە مۆرفۆلۆژیی زمانی ئەدەبیدا :

« کـاڵ بۆوە پـەنجـەی جوانـان
کوانێ گـەرمـەی جێ ژوانـان »

« هێمن »

٢ ـ بە دوای بزوێنی / •• ۆ ، •• ێ / دا :

أ ـ بخۆ + ەوە = بخۆ + ر + ەوە •

ب ـ بلێ + ەوە = بلێ + ر + ەوە •

بەچاو ئەم کـارەداخوازیـانـەوە ـ نەك بە گشـــتی ـ تێوبڕ نەبێو بزوێنەبەرایی تێبچی ، ئاڵۆزە زمـــانی پەیدانابێ •• بەلاّم تاودانی جووتە روخسار [ ەوە / وە ] نابەجێیە ، وەك لەم بەیتەدا :

« کێ بوو لـە براهیم پاشـــــای گوڵباوە
دەرکی کـــردەوە ، پـەردەی هــــەڵداوە »

« داستانی دمدم »

**بەراوردێك :**

بە دوای بزوێنەوە بە فۆرمی [ وە ] خۆی یدا بەدەستەوە ، بە پێچەوانەی هەرێمی سلێمانی ، سێ ناوچەی : موکری ، سۆران ، هەورامان ـ دەستەملانن ، وەك :

( گەڕاوە ، ئاماوە = گەڕایەوە )[٧٦] بەچاو هەر سێلاوە ، تەنها لە ئاخاوتنە موکریەکەدا تووشی گیروگرفتێکی سەختدەبین ، بەوێنە ، کە گوتمان : ( گەڕاوە ، بایداوە ) بەچی بزانین کە مۆرفێمەکە بۆ دووبارەیە یان بۆ رابوردووی نزیکە ؟ .. تەنها لە گۆکردنداو بە قورسەدەنگ « نبرە » لێکدی جیادەکرێنەوە دەستووریش لە دابینکردنی قورسەدەنگدا نامۆیە ؛ کوردێکی موکری کە دەڵێ :

( بایانداوە = بایاندایەوە = گەڕانەوە بەدواوە ) هەرهەمان روخسارە کار ، بەکار دەهێنی بۆ رابوردووی نزیك :

( بایانداوە ) وەك بادانی دوو هەودا ، یان جەڕاندنی هەرشتێك لەگەڵ شتێکیدیدا .

لە گۆکردندا هەر دوو مەبەست بە ئاوازەی خۆی دەردەبڕدرێو قورسەدەنگ دەخاتە سەر بڕگەی/دا/ کە بایانداوە رابوردووی نزیکبێ ، کە بۆ دووبارەشبێ دەیخاتە سەر بڕگەی / وە / . بەراستی

---

(٧٦) بەچاو ئاخاوتنە هەورامیکەوە ، ( وەك لە سەرەی خۆیدا لێیدەدوێم ) یان لە سۆرانیەکەدا ، ئاڵۆزکان پەیدانابێ ، یەکێك لە هۆیەکان جیاوازییەکی زۆرە لە نێوان پاشگری دووبارەو نیشانەی رابوردووی نزیکدا .

قورسەدەنگ دەوری خۆی هەیە لە گشت زمانێکدا[٧٧] ، ئەمیش سەر بە جوانبێژیو خاڵبەندیە نیشاندانی هەموو هەستو نەســـتی دەروونی یان هەڵچوونو خاوبوونەوە ••• لە وە زەبــەنـدتــرە کە بچێتە ژێــر رکێفی مۆرفۆلۆژیەوەو بەنووســـــین • لادان لە رێژگەی ( بایانداوە ) بۆباری ( بایاندایەوە ) یــان بە پێچەوانەوە ، هۆیەکی تایبەتیی هەیــەو جارێ لێی دەوەستم •

— وەك پێشگر لە موکریو سۆرانیدا :

أ ـ لەگەڵ وشەی نالێكدراوداو بە تایبەتی لەتەك کاری داخوازیدا ، دیاردەیەکی زاڵەو بە کزیش لە دەستەشێوەی شارباژێڕدا •

بۆ ئەم نموونانەی خوارەوە :ـ

— وەشرین = شاردنەوە •
وەشرم ، وەشێرم = بشارمەوە (٧٨)
— ئاوێ وەخۆ = ئاو بخۆرەوە •

---

(٧٧) بە نموونە لە فارسیدا ئەم رستەیە :
« من فردا صبح تنها سواره خواهم رفت قم »
بەپێی قورسەدەنگ هەژدە مەبەستی جیاجیا دەدا بــە دەستەوە یان لەم شیعرەدا :
« ای خواجە ضـــیا شود زروی تو ظلَم
باطلعت تــو ســــــــــور نماید ماتم »
ئەگەر قورسـەدەنگ لەسەر ( ضـــیا و ســـور ) بێ ، ئەوا مـــەدحو پێدا هەڵدان دەگەیەنێ ...
خۆ ئەگەر لەسەر ( ظلَم ـ و ـ ماتم ) بێ ، زەمو دزێوی دەگەیەنێ !!
دستور جامع زبان فارسی ل ٤١ .

(٧٨) هەروەها ( وەی کوژێ = بێکوژێنێتەوە ) فەرهەنگی تحفە مظفریەی ئۆسکارمان .

ـــ دەرکێ وەکە = دەرگایەکە بکەرەوە •

ـــ قسانم بۆ وەگێڕە = بۆم بگێڕەرەوە •

**ئەمانەو چەندان نموونەی‌دیکە ، کە مۆرفێمەکە بووەتەوە بە پێشگر ،** واتە هەڵچەرخاوەتەوە • گوتمان دیاردەیەکی زاڵــە بەچــاو ، ئاخاوتنی سلێمانیەوەو هۆی تایبەتی هەیە •

کــە هەڵیش‌بگەڕێتەوە بزوێنــە بەراییەکەی گۆنـاکرێ‌و چەندوچۆنی ناوێ •



## ئاوڕێــك

أ ـ لەو حەلانەدا کــە مۆرفێمی دووبارە لەگەڵ کــاری داخوازیــدا سەودادەکا ، نیشانەی داخوازی لە نێودەچێ ، وەك :

( وەکــە ) لــە بنجــدا بریتیە لــە ( وە ـ بـ ـ کە ، وە ـ بـ ـ گەڕێ ←←← وەگەڕێ ••• ) •

لەوانەیە گومان ببرێ کە بڕگەی ( وە ) لەو شوێنانەدا لەبری نیشانە داخوازییەکــەبێ ؟ بەلاّم راســــــتنیە ؛ بێتو وابوایــە ، گەڕانەوەو دووبارە ••••• ی نەدەگەیاند •

ب ـ لەوەش بەئاگاین کــــە دیاردەیەکی دیکەش هــەیــە : گۆڕانی ئامرازی ( بە ، پێ ) بە [ وە ، وێ ] ، وەك لەم نموونانەدا :

١ ـ وە بیرم‌دێتەوە = بەبیرم دێتەوە •

٢ ـ ئەگەر وە دەســـتە وە کەری کرابــا ،

وای لێ‌نەدەهات ←←← دەست‌کردنەوە •

٣ ـ پارەکەی وێ دەوە ⟵ پێ بدەرەوە •

چەند نموونەیەکی دی :

ـــ وە دەست کەوتن ⟵ بەدەست کەوتن •

ـــ وە دەرکەوتن ⟵ بەدەرکەوتن •

ـــ وە دیهێنان ⟵ بەدیهێنان[٧٩] •

یـان ، وەك :

« وەتەن ! گیانو ســــــەرو ماڵم فیدای تۆ
وە گیـانی مـن کــەوێ دەردو بەڵای تۆ »

« هێمن »

دیسان لەم بەیتەدا :

« لە خارێ وە دەرکەوتن دەریان دەکرد گەڵایە
ئەو گوڵی زەردو زەریف بوونە بەرگی دنیایە »

« ئەحمەدی کۆر »

ج ـ مۆرفیمی دووبارە ـ وەك پێشگر ـ لە وشەی لێكدراودا ، لـە گشت دەســـــــتە شێوەکاندا ، باوە ، بەڵام لە موکری و ئەردەڵانیـــدا ـ بۆشوێنی خۆی ـ زاڵەو کاریانکردوەتە شارباژێڕیەکەش • لە موکریدا :

---

(٧٩) د. نەبەز لە ( زمـانی یەكگرتوی کورد ) دا ، چـەنـد نموونـەیـەکی ئاوێستا دەهێنێتەوە کە دەنگی « ڤ » لە ( ب ) رەسەنترە ، ئەو شێوە موکرییانەش دەکاتە بەڵگەی ئەوە کە بڕگەی ( وە ) لە ( بە ) رەسەنترە. لەو بارەیەوەو لە بەشە رەخنەکەدا ، چەند سەرنجێکم دەرخست .

منیش دەڵێم : ئەگەر بەرەو هەوارگەی جافو گەرمیان بابدەینەوە گۆڕانی دەنگی ( ب ، م ) یان بڕگەی ( بە ، لە ) بـە ( و ، وە ) گـەلێ بەهێزترە !!

— چاڵ پڕەوەکردن ← ... پڕکردنەوە .

— بـەروەدان ← بەردانـەوە .

باشترین نموونە ، لەم بەیتەی « ابن الحاج » دا :

« یـارەب ئـەوان پاکـەوەکـــات

عیســـا مونـاجاتێ دەکـات »(۸۰)

ئەو دیاردەیە خۆی لـە ئاخاوتنی سلێمانیش خزاندوە :

« کاروان هەموو باری‌کردو ڕۆیشتن ، تۆش

خـۆت ( گورجـەوەکـە ) ڕۆینت نزیـکە »

« بێ‌خود »



## — ۲ —

❋ نیشانەی کاری ڕابوردووی نزیك لە موکری‌و سۆرانیدا :

یەکەم ـ لە ئاخاوتنی موکریدا بەگشتی هـەر بەو شێوەیەیە کـە لـە ئاخاوتنی سلێمانیدا خۆی ساغ‌کردوەتەوە و لە خۆیدا بریتیە لە [ وە ] .

(۸۰) مەهدی‌نامە ، چاپێ کوڕی زانیـــاری ســـــالی ۱۹۷۵ ـ ل ۶۲ . ســاغ‌کردنەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی . تەمەنی ئەو نووســـینەی ( ابن الحاج )ی سنجوێیی ، پوختەی شێوە موکریەکە دەگێڕێتەوە بۆ دووسەدو بیست ساڵ .

بۆ لێ‌کۆڵینەوەی دەقە زمانیەکانی ئەو دەســـتە شـــێوەیە ، ســەرچاوەیەکی بەکەڵکە . بـا لـەم دەربازگانەوە بڕوانینە کەلەپوورە نەتەوایەتیەکان ... بە هەمان سەودا بۆ « گوڵ‌گەشتێك بە مێرغوزاری خانای قوبادیدا » . ئالانی ـ ۱۹۷۹ .

تێچوونی بزوێنەکەی و پسانەوەی لە هەندێ بارداو راکێشـــــانی تێوبڕ لەکاتی پێویستیدا ، هەر بە ئەو چەشنەیە کە بە تەسەلی لە دەســـتە شێوەی شارباژێڕدا لێیەوە دوام • کە واتە بۆ ئەم دەقانە :

« چی پێغەمبەرێ کـــە بـووە
ئوممەتی ئـاگـاھ کــردوە »
« ابن الحاج »

« ئـــەو کـارانـە وا پێـكنـایـە
تـازە نـەهـاتومـەتـە کـایـە »
« تحفەء مظفریە »

هەروەها بە تەواوەتیو بە تێوبڕەوە لە ئەدەبیاتی تازەیاندا :ــ
« نیەباکم ئەگـەر زاڵم شـــــکاندویەتی باڵی من
ئەوە سەختە کەوا نەگاتە گوێی کەس نالەناڵی من »
« هێمن »

ــــ لە دەقەکەی ئوسکارماندا :

( نەهات + و = بەشە نیشانە + م = راناو + بزوێنی پســـــاوەی نیشانە + ت = تێوبڕ + ئامرازی پرپۆزیشن •

ــــ لە دەقەکەی ـ هێمن ـ دا :

شکاند = رابوردووی رەبەق + و = بەشە نیشانە + یـ = راناوی کارا ••• ( ە ) = بزوێنی پساوە • + ت = تێوبڕ + ی = راناوی بەرکار•

تێهەڵ ناچمەوەو لەوەوبەر ، رێسەم بەو جۆرە شیکردنەوانە داوە •

ــــ بەکزیو بە تاوی سۆرانیەکە ، لە موکریشدا ، نیشـــــانەی [ وە ] بە [ یە ] دەردەبڕدرێ ، وەك :

« عالەم بۆ ئەو بزوتیە
چاك شەڕێك لەسەر دینیە »
« دمدم ، ئۆسكارمان »

دوەم : هەمان نیشانە لە سۆرانیدا :

أ ـ كە رابوردووی نزیك تێنەپەڕبێ :

| بابانی | سۆرانی |
| --- | --- |
| داچوە | داچویە |
| هاتوم | هاتیم ـ هاتـ / ییم |
| هاتوم ، هاتوین | هاتیم ، هاتیین |

جووتە مۆرفێم :

« هاتـ + وە + تـ + ەوە ⟵ هاتـ + یێ + تـ + ەوە »

ب ـ كە تێپەڕ بێ :

| بابانی | سۆرانی |
| --- | --- |
| گرتومە | گرتیتم شتەكەم گرتییە |
| گرتویە | گرتییە شتەكەی گرتییە |
| خنكاندومە | خنكاندیتیم شتەكەم خنكاندییە |

دەشگوترێ :

| | |
| --- | --- |
| شێتی كردوم | شێتی كردیمە |

واتە بە دەركەوتنی بزوێنی « ە » لەگەڵ راناودا .. وەك لە بەشە ئاخاوتنی سەروودا .

به هەرحاڵ مەردانی ئەو دوو هەرێمە بەرەو زمانە پەسەندکراوە مێژووییەکە تەکانیان‌داوە :

« بەخۆی شێرە وەکو ناوی لەشەڕدا ، دوژمن ئەندازە
تەمایان هەر بە ئەو ماوە تەواوی خاکی کوردستان »
« حاجی قادری کۆیی »

**وردکردنەوە :**

— هاتوم ⟵ هاتیم ، هات / یم .

— خنکاندومە ⟵ خنکاندیتم ، خنکاند / یتم .

لە بابانیدا ، کە تێنەپەڕیو بۆ یێجگەی سێیەمی تاك ، تەنها بەشی یەکەمی نیشانەکە ( و ... ) دەمێنێتەوە . لە سۆرانیشدا و لە تێکڕای (یە) بەشی ( یـ .. ، یی .. ) دەمێنێتەوە . لەم تێچوونە بزوێنەدا ، گرفت‌نیە . بەلاّم لە تێپەڕداو لە دەستە شێوەی باباندا ، تێکڕای نیشانەکە ، بە مەرجێ راناوی بەرکاری کۆی لەگەڵدا نەبێ ، بە پساوەیی دەمێنیتەوە . کەچی لە سۆرانیدا بە چەشنی تێنەپەڕ بزوێن نامێنێ و ( ت ) یەکی زێدە ، دەردەکەوێ ؟!

جارێ ناتوانم دوابڕیاری لەسەر بدەم ؛ هەر ئەوەندەی بۆ دەچم : لەو نموونانەدا پێویستی‌ی ترازاندن‌و جووت‌بوون نەی‌هێناوە .. دەشێ کە بۆ جیاکاری تێپەڕو تێنەپەڕبێ .

یێجگە لە ئەرکی ڕێزمانی ، باری دەنگسازی‌و تابینا کێشی‌دەکاو میانەیەکی تەواوی هەیە ، وەك : ( دەکا ، دەکات ، ئەوەتبە ،

ئەوەتەم ... )[٨١] •

لێرەدا هەر ئەوەندەم بۆ دەلوێ کە بڵێم : کرمانجیی سەروو ، کاری لە دەستە شێوەی سۆران کردوە کە ( •• وو )ی درێژو بڕگەی [ وە ] ی کراوە تایبەتی گۆکردنی کرمانجیی سەروونین و نیشـــــــانەکە بە ( یە ) دەردەبڕن ، لەم حەلەدا ، مۆرفێمی دووبارە چ بە [ ەوە ] و چ بـە [ وە ] بێ ، ئاڵۆزی لەگەڵدا پەیدا ناکا • دیسان سۆرانیەکەش کاری لە موکریەکە کردوەو بزوێنە بەرایی [ ەوە ] بەدوای بزوێنەوە تێدەچێو تێوبڕ سازنادا ، وەك روونمکردەوە ، شێوە موکریەکە گرفتیتێدا پەیدابووە •

بەبێ بەراوردێکی چڕ لە شێوەکاندا ، جارێ ناتوانین بلێین : نیشانەی [ وە ] یان [ یە ] ئەمیان ناو ئەویان بنجیە •• ؟



**پاشکۆ ئامرازی پەیوەندی :**

دیسان لە موکریو سۆرانیدا ، بە روخســـــاری [ ەوە / وە ] لـە برەودایە •

---

(٨١) ئەوە + تـ + ە = ئەوە شتەکەیە .
— ئەوە + تـ + ە – م = ئەوە منم ...
— ئەوەتان = ئەوەتەن ... هتد .

بۆ باری سەرنج :ـ
ئەو رشتانە لە دۆخی تابیناو دیاردیکردندانو سواودی رســـــتەی تەواونو بە ئیشارەناو ، دەستیان پێکراوە ، لە ناوچەی خۆشناوەتی بیستومە : « ئەوە تهێ ، ئەوە تتهێ » بۆ هەمـــان مەبەســـــتی ، دیاردیکردن . بڕگەی ( هێ ) دەمان باتەوە بۆ ئەسڵی کارە وجودیە سەنسکریتیەکەو لــە کوردیـــدا وەك بزوێن خۆی دەردەخاو لــە باریتاکدا . لێرەدا دەنگی ( ت ) وەك نێوبڕو وەك نیشانەی تابینـــا ، خۆی دەردەخا . ئەو رشتانەش لێکۆلینەوەیان دەوێ .

أ ـ به دوای دەنگدارەوە ، به فۆرمی [ ەوە ] وەك :

« بۆ بەشی مە خواریـە لـەو قامەتی شـــــــیرینی تۆ
خارو خورما ـ پێکەوە ـ دەگرێ ئەگەر نەخلی روتەب »
« میسباح دديوان »

پێکەوە = بەیەکەوە .

ـــ له هەندەرانه ..... به دارانەوە .... هتد .

ب ـ به دوای بزوێنەوە به فۆرمی [ وە ] :

« کی بوو لـە زەمیل فرۆشی گولبـاوە
ئەگـەر چوو ، نەگـەڕاوە بـە دواوە »
ـ تحفهء مظفریه ـ

---

لەم دوو دەستە شێوەیەشداو به دوای بزوێنەوە بەرایی پاشـــکۆکە تێدەچێو تێوبڕ سازناداو بێزیانه .

✻ وەك دیاردەیەك برێ جار پاشکۆکە به « ڕا » دەشکێتەوە ، له هەندێ دەستە شێوەی گۆرانـداو له گەرمیان ســـەرهەڵدەداتـەوە ـ بۆ شوێنی خۆی ـ لەم کۆچورەوەدا بەسەر ئاخاوتنە سلێمانیەکەدا تێدەبڕێو دەی بوێرێ . !!

« لەمن ... ڕا خـۆ خەتایـەك ڕووی نـەداوە
ئـەدی بێمـەیلی بۆ ڕووی داوە لـە تۆڕا »
« هێمن »

ـــ له من ڕا = له منەوە .

ـــ له .. تۆ ... ڕا = له ... تۆ ... وە .

پرسیار : ئایا دەتوانین بڵێین کە هەر دوو فۆرمی پاشـــــــکۆکە بنجین ... یان ، یەکێکیان ... ؟ •

بڕیاردان لەسـەر بنجێتیی [ ەوە / وە ] بەجووتە ، بـەلای منـەوە کارێکی نادروستەو بێ پەروا ، زمان شتیوا ناخاتەوە •

چەند جار گوتومە : تێچوون و سوانەوە کارێکی رەچاوکراوە لـــە زماندا ، بە مەرجێك نەبێتە هۆی چەواشە بوون •

بە نموونە لە ( پێ+ەوە ، لێ+ەوە ، تێ+ەوە ⟵⟵ .... وە ) دا ، پێویست بە تێوبڕ ناکا ، تـا بزوێنە بەرابیەکە بپـارێزێ یان کـە دەڵێین : ( لە دارا .. وە نامەم پێ گەیشت ) ئەو تێوبڕانەی کە لەو سێ دەســـتە شێوانەی کرمانجیی خواروودا خۆیان چەسپاندوە ـ وەك : یـ ، تـ ، ن ، ر ... ـ هەرکامێکیان بێتە تێوەوە ، لەگـەڵ باری راناویـدا ، ئالۆزیی پەیدادەکا ، وەك بڵێین :

١ ـ لە .. دارا .. یەوە ، لە .. دارا .. تەوە ...

٢ ـ پێ / یەوە ، تێ / تەوە ، تێ / نەوە ...

دوەمیان کە بە لێكدراو حەلێب بن ، نەك بە تاوی گەردانو لەرسـتە سازیدا •

ســـەرنج :

١ ـ هەندێ جار ئەو پاشـــکۆیە بە ( ێ ) دەشـــکێتەوە ، وەك :

( هاتمە ماڵێ = هاتم بۆ ماڵە وە ، یان بۆ ماڵە وە هاتم ) نموونەیەکی دی :

« گەلێك جـاران لـە چاڵاوی رەش کـەوتم

هاتمە دەرێ ، هەدامنەدا ، نەســــــرەوتم »

« هێمن »

٢ ـ جاری وا هەیە لەگەڵ ئاوەڵکاردا وا جۆشدەخوا ئالقە ئامرازەکەی بەرایی فەرامۆش دەکا ، وەك :

( فریایماڵەوە کەوتم ، بنەوە نا ، سەرەوە بگرە ٠٠ ) ئەو سەودایە زەینی هەندێکی ترازاندوە کە دەڵێن : « تێکرای ـ سەرەوە ، بنەوە ٠٠٠٠٠ هتد » ئاوەڵکارن ٠ بە دووری نازانم کە لە مەفهومی ( فوق ، تحت ) ی عەرەبییەوە لە کوردیەکەشیان روانیبێ ٠٠ !!

---

**تێبینی :**

دەگوترێ :ـ

— چومە ئاشی ـ ٠٠٠ بۆ ئاش ٠

— چوومە ماڵێ ـ ٠٠٠ بۆ ماڵ ، ماڵەوە ٠

— چوومە سەرداریّ ـ ٠٠٠ بۆ سەر دار ٠

— چوومە سەربەردی ـ ٠٠ بۆسەر بەرد ٠

ئەم دیاردەیە سەر بە ( معمولیة ) و دەمان باتەوە بۆ دۆخی نێرو مێ ، کە لەو نموونانەدا ( ئاش ، بەرد ) توخمە نێرنو نیشانەی ( ی ) تەواوکەری پرپیۆزیشن وەردەگرن ٠ دیسان ( دار ، ماڵ ) توخمەمێنو نیشانەکە ( یّ ) ی کراوەیەو بۆ هەمان مەبەست ٠٠

ئەم لایەنە باسێکی سەربەخۆی دەویّ ٠



## خشتەی ژمــارە

«٢»

| | بابانی | موکریانی | سۆرانی | | باری لکان |
|---|---|---|---|---|---|
| پاشگری دووبارە | [ ەوە ] | [ ەوە ] | [ ەوە ] | ← | بەدوای دەنگدارەوە |
| | [ ەوە ] | [ ••ەوە ] | [ ••ەوە ] | ← | بەدوای بزوێنەوە |
| | [ ەوە ] | [ ەوە ] | [ ەوە ] | ← | کە بزوێنەکە / •• یـ / بێ • |
| | [ •••ە ] | [ •••ە ] | [ — ] | ← | بـە دوای ئاوەڵناوی کۆتایی بە ( و ) ی دەنگدار • |
| | [ — ] | [ — ] | [ ەوە ] | ← | بە دوای ئاوەڵ ناوی کۆتایی هاتو بە / یـ / دەنگدار |

| | بابانی | موکریانی | سۆرانی | | باری لکان |
|---|---|---|---|---|---|
| لە دوخساری پێشگردا | [ — ] | [ وە ] | [ وە ] | ← | لەگەڵ سـادەدا |
| | [ ەوە ] | [ ەوە ] | [ ەوە ] | ← | لەگەڵ لێکدراودا |

| | بابانی | موکریانی | سۆرانی | | باری لکان |
|---|---|---|---|---|---|
| نیشانەی ڕابوردووی نزیك | [ وە ] | [ وە ] | [ یـە ] | ← | کە لەگەڵ ڕاناودا نەبێ |
| | [ وو•• ] | [ وو•• ] | [ ى‌ى ] | ← | بۆ تێنەپەڕ لەگەڵ ڕاناودا |
| | [ وو••• ] | [ وو••• ] | [ یت ] | ← | بۆ تێپەڕ لەگەڵ ڕاناودا |
| | [ وو•• ] | [ وو•• ] | [ یـ+تـ ] | ← | لەگەڵ ڕاناوی کۆی بەرکاردا |
| | [ وو•• ] | [ وو••• ] | [ یـ••• ] | ← | لەبڕێ جێگاداو تێپەڕبێ |
| | [ وو•• ] | [ یـ••• ] | [ یـ••• ] | ← | بە تاوی سۆرانو بەکزی • |

| | بابانی | موکریانی | سۆرانی | | باری لکان |
|---|---|---|---|---|---|
| پاشگری ئامراز | [ ەوە ] | [ ەوە ] | [ ەوە ] | ← | بە دوای دەنگدارەوە |
| | [••وە ] | [••وە ] | [••وە ] | ← | بە دوای بزوێنەوە |
| | [ — ] | [ ڕا ] | [ ڕا ] | ← | لە بڕێ ئاخاوتنی گۆرانیشدا |

**تێبینی :**

— بە تێکڕای ئەو ڕواڵەتانە لە کاردان ••• کۆچو ڕەویان لە تاقە زمانێکدا کارتێکراێکی ئاساییە ، بە هەمە ڕوخسار نەك بە شێوەیەکی بنجیو سەربەخۆ • سەرجەمیشیان لە ڕکێفی گرامەری زمانی نووسیندا نین •

## — ١ —

# مۆرفێمی دووباره

* له بواری ئه‌م به‌راوورده‌دا ، ره‌تبلاوده‌بم چونکه ده‌سته شێوه‌کانی گۆرانی‌و لوڕی‌و ئه‌رده‌لانی ، ته‌واو به یه‌کدا چڕاون ؛ هه‌لاویشتنی ئه‌و سێ مۆرفێمانه له‌سه‌رم به زه‌حمه‌ت ده‌که‌وێ :

ده‌سته شێوه‌ی ئه‌رده‌لانی ، له سه‌رووی رۆژهه‌لاتیه‌وه موکری بالی به‌سه‌ردا کێشاوه ، له خوارووی رۆژهه‌لاتیه‌وه به شێوه‌ی گۆران ته‌واو کاری گه‌ربووه • وه‌ك شێوه‌یه‌کی گه‌شه سه‌ندوو له‌شاره‌که‌ی ( سنه ) دا په‌نجه‌ی بۆ ڕاده‌کێشرێ •

— نموونه‌ی نێوه‌ند ـ بۆ هه‌مان مه‌به‌ست ـ وه‌ك له‌م چوارینه‌یه‌دا :

« له‌م خه‌وگای چه‌رخا منی شه‌یدائی
چاوێکم کرده‌و له بۆ بینائی •••
هه‌رچه‌نم کۆشا که‌س خه‌وه‌ره‌و نه‌وو
له ته‌نیائیا منیچ چوومه خه‌و »

مه‌ردۆخی به‌هه‌شتی له فه‌رهه‌نگه‌که‌ی خۆیدا ( جـ١ ل ٦ ) ده‌رده‌دلی‌ی خۆی به‌م دوو به‌یته ده‌ربڕیوه • له‌لا پاڕه ( ٢٤ ) ی ئه‌و فه‌رهه‌نگه‌یدا ـ که

به تێکستی تایبەتیی نووسـیویەتیو وێنـەی گیراوەتـەوە ، هەر ئەوەندە دەڵێ :

« پیتك دووبارە : وە وە ـ هاتـو ، هاتوە » نووسینەوەکەی تـا رادەیەك فارسی ئامێزە • لە سەرتاپای فەرهەنگەکەیدا ئەم نیشـــانەیەی داناوە « ـ » •

دوای لێوردبوونەوە ، بۆم دەرکەوت : کە نیشانەی ئەو بڕگانەیە ، لە دوای بزوێنی « ە » کۆتـاییـــان بە دەنگی وێســـتاوە ، جا / و / ی کۆنسۆنانتبێ یان هەر دەنگێکیدی وێســـتاو ، وەك ( پـر ور دە = پەروەردە ) •

بە سەرنجدانی خێڵە وشەی سەربە دووبارە ، لەو فەرهەنگەیدا ـ کـە ئەردەڵانیانە دایڕشتوە ـ مۆرفێمی دووبارەی لـە دوو قاڵبـدا داوە بـــە دەســتەوە :

أ ـ بە تێکڕای [ ەوە ] ⟵ بڕینەوە ، بردنەوە •

ب ـ فۆرمی [ ەو ] ⟵ هاتەو ، کردەو •

ئـەم دیاردەیە لـە ئاخاوتنیـانداو لـە وشـــەی لێکدراودا ـ وەك پێشگر ـ زەقدەبێتەوە :ـ

— پانەوکردن ⟵ پانکردنەوە •

— پڕەوکردن ⟵ پڕکردنەوە ••• هتد •

بە تاوی گۆران جاربەجار دەیشـکێننەوە بە « ۆ » وەك : ( هاتۆ ، ڕۆیشـتۆ ) •

تۆژینەوە :

لەو دوو بەیتەیدا مۆرفیمەکە وەك پێشگرو پاشگر دێ بە دەستەوە :

أ ـ چاوێکم کردەو •

ب ـ خەوەرەو نەوو = واتە : خەبەر نەبوەوە •

گۆڕانی دەنگی / ب / بـە / و / لە سەرتاپای گۆرانی و لوڕیدا ، دیاردەیەکی فرەزەقەو تاراددەیەك لە موکریداو بەتایبەتی لە بڕگەی ( بە )ی ئامرازدا کاری خۆی کردوە •

چوونـە بنجوبناوانی ئـەو کارتێکرانـەو خۆڕادانی بـەرەو هەرێمی کوێستان ، لێکۆلینەوە ـ یەکی ئەکادیمیانەی سەختی دەوێ •

ئەوەی‌کە زەینم بی‌بڕێ ـ لەو مەسەلەیەدا ـ کارتێ‌کردنی ئاوو هەوایە ( التأثیرات المناخیه ) لە لچولێو کرژبوونەوەو کاکیلە جیڕ بوونەوەدا وەك لەکاتی چەقوچۆو سەرمادا ••• یان دەم‌ولێو هـەلـۆل‌کـردنو لچـولێـو دەرپۆقاندن و هەنکەهەنك لە نێوەندی گەرمێندا[٨٢] ئەمانەو چەندان‌هۆی دیکە ـ وەك کۆچ‌ورڕەو ـ لە پەیدابوونی دەنگ گلماندنو راهاتن بە بڕگە گیرەکان ، یان لە تەقینەوەی ریزە بڕگەی تەنافیی کراوەدا وەك لە چەقی نێوەندا ، بەرهەست دەبن •

کە بە نیگایەکەوە ئەم لایەنەم ورووژاند پتر بۆ باری ســـــەرنجەو

---

(٨٢) ئەم لایەنە لە دەنگسازیدا شاراوە نیە ، کەواتە بۆ ســـــەرنجدانی ئەم پەرەگرافە :

« انفرد العرب باحتفاظ اصوات الحلق التي اهملت جميعها في كثير من اللغات ، ويعلل بعضهم ذلك بعلة الجو والمناخ ، حيث يتيسر العرب ان يفتح صدره الهواء ، ولا يتيسر ذلك لابناء البلاد الباردة ، وحيث يحتاج العربي الى النداء في الصحراء ، ولا يحتاج اليه سكان المدن والاودية المتجاورة » .

اللغة الشاعرة / عباس محمود عقاد ص٥٦ .

هەڵکـــەوتو کۆچو ڕەوی ئـەو مۆرفێمانـە ، دەســـتبەرداری ئـەم لایەنانە نابن •

هەڵچەرخانەوەی مۆرفێمەکە بە [ ەو ] لە وشەی لێکدراودا ، لـــە ئەردەلانیدا زەقە ، بە تێکڕای [ ەوە ] لە موکریدا بە پلەی دوەمو بە کزی لە بابانیدا = ئاخاوتنی سلێمانی •

ســـەرهەڵدانی ئـەو تەوژمـــە ، بادانەوەیەکە بۆ تایبەتێکی دێرینەی زمانەکەمان ، ئەویش دیاردەی وشەی لێکدراوە ، کە دەڵێین ( پانەوکردن ، پڕەوکردن ••• هتد • پتر دەیجۆشێنی و بەرەو دیاردەکە کێشـــیدەکا ، تاوەکو بڵێین : پانکردنەوە ، پڕکردنەوە ••• ) • دیارە قالبە ئەردەلانیەکە لە گۆکردندا سوارترەو ئەوەندە هەناسەدانی ناوێ وەك لە قالبی دوەمـدا هەستی پێدەکرێ ، بەلام وەك لە دواقۆناغداو لە بارەی ئەرکـــەوە ، لێی دەکۆڵمەوە ، هێلانەی مۆرفێمەکە دوایینەی وشەیە • تائێرە لـە نموونـەی نێوەندم کۆڵیەوە •

---

بەڵگەکارییەك لە لێواری سەرووی هەرێمەکەدا ؛ دەستچنێك لـــەم پـارچـە فۆلکلۆریـەی [ ئـاگری ] دا[٨٣] بۆ تـاوتـووی مۆرفێمەکـــەو هاوروخسارەکانی :

١ ـ « دایدا شـــــلێوە لە لووتکەی کێوان
بەفراوان تاوانەو تا بانگی شــــێوان »

لە سەرتاپای دەمەتەقی فۆلکلۆریەکەیدا دارشتنەکەی موکریانەیە ••

---

(٨٣) نازناوی دوکتۆر عەلی گەلاوێژە ، لە هۆزی فەیزوڵلابەگیی ناوچەکانی سەقزو بۆکانە ، دوکتۆر مارف خەزنەدار لە پاییزی ـ ١٩٦٧ ـ دا کە سەری لە باکۆ داوە ئەو پارچە هۆنراوە = نظم ـ ی لێ وەرگرتوە و بە ناوی (زووحەیاتەین) لە گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات (ژ ١٧ ، ١٩٧٤)دا بلاویکردوەتەوە .

بێجگە لە مۆرفێمەکە ؛ لەسەر شەقڵە ئەردەڵانیەکە دەوردەبێتەوە ، وەك لە ( تاوانەو ) دا ، گەردانی کارەکەو مۆرفێمەکە ، تایبەتیەو بەرانبەرەکەی لە موکریدا ڕێژگەی ( توانەوە ) یە ، لەم دیاردەیەدا ، بزوێنە دواینەی پاشگرەکە ، قرتاوەو تەنها بۆ سواربوونی بڕگەکەیەو لە بوونیدا چ بەرهەڵستێکی فۆنەتێکی نیە •

٢ ـ « بەڵام ئەمانەش وشکەو بوون یێك یێك
تەنیا گوڵێك ما لە پەنای بەردێك •• »

لە وشەی لێكدراودا وەك پێشگر بەکاری هێناوە :ـ

( وشکەو بوون = وشکەوە بوون = وشكبوونەوە ) • کە دیاردەیەکی زاڵی ئەردەڵانیە • لەمەوبەر بە تەسەلی ، لێیەوەدوام •

٣ ـ « بەینێکیش رابرد ئیتر دەم بەدەم
لێڵەی ئەم گۆلەش نیشتەوە کەم‌کەم »

ئەم بەیتەی تێکەڵەی سێ دەستە شێوەیە :

— رابرد = رابورد ⟵ موکری •
— ئیتر : گۆرانی و بابانی و ئەردەڵانی •
— لێڵە : ئەردەڵانی = لێڵاو •
— نیشتەوە : لە هەموو دەستە شێوەکانی کرمانجیی خوارووادا • وەك گوتم لە ئاخاوتنی ( سنە ) شدا بە دوو فۆرم بەکارهاتوە •

✻ دیسان پاشکۆی ئامراز لەسەر دەقی پاشگرەکە بەکاری دەهێنن وێستەی لەسەردەکەن :

« لەبن زیخانەو بەوەو نووسابوو »

واتە لەبن زیخەوە بە ئەوەوە نووسابوو •

به زاڵبوونی دەستە شـێوەی موکری لـە لێواری هەرێمەکەوە ، بزوێنە بەرایی مۆرفێمەکە تێدەبەن ، وەك :

« چۆم دەنگی داوە ـ و دۆڵ زرینگاوە

شـاخە بەرزەکان ئەم دەنگەی داوە »

**کورتە ئەنجامێك :**

١ ـ مۆرفێمی دووبارە لە قاڵبی [ ەو ـ EW ] دا مۆرکی ئەردەڵانیە ، وەك پێشگرو لە وشەی لێکدراودا خۆش‌دەستو بەکارە • تا بەرەو خواری هەرێمەکـە بینـەوە ، ســـوانەوەو دەمخاوی تـەنگی پێ‌هەڵدەچنێ‌و لە فۆرمی / ••ۆ / دا ، دەسوێتەوە •

٢ ـ ئەگەر بە تەوژمیش نەبێ دەست‌بەرداری تێکڕای [ ەوە ] نابن •





● **نیشانەی رابوردووی نزیك :**

لە دەستە شێوەکانی دیکەدا باس‌کراو باری رەســەنێتی لە فۆرمی [ وە ] دابوو •

لە ئەردەڵانیدا ، وەك مۆرکێکی تایبەتی بە [ گە ] لە برەودایە ، وەك : ( هاتگە ، بووگە ، چووگین = هاتوە ، بووە ، چووین ) •

شکانەوەی چەند دەنگێك بە / گ / هۆیەکی سەرەکیە لـە دابڕانی زوربەی دەستە شێوەکانی هەرێمی گۆرانو ئەردەڵان • بۆ سـەرنجدان : هەر لە ئاخاوتنی سنەیانەدا ، کاری بزرکارا ( مبني للمجهول ) بـەم رەنگە دەگوترێ ـ ئەگۆڕگێنەوە = ئەگۆڕدرێنەوە ، ئەوێـژرگێن = دەبێژرێن ،

ئەنووسرگێن = دەنووسرێن • یـان سـووتیاگ ، برژیاگ ، کریاگ ••• بۆ ئاوەڵناو •

دیاردەی گۆڕانەدەنگ کارێکی ئەوەندە ئاشـــکرایە ، دەمەقاڵێی لەسەرنیە • دابڕانی شێوەیەك یان دەستە شـێوەیەك لـە دەنگ گۆڕینێك یان چەند دەنگ گۆرینیو کەمە سوانەوەیەك ، پەیدادەبێ ؛ بە نموونە لـــە زمانێکی دوورە نەژادی کوردیدا ، وەك عەرەبی دەگوترێ : گال = قال ، گەمیل = جمیل ، ریل = رجل ••• بەڵام زمانی پەسـندکراویان ، ماوەی بەو تێچڕانە نەداوە بارە دەروونیەکەیان وا راهاتوە کە ـ قال ـ بە ئەسـڵی ( گال ) دابنێ •• لەوانەیە بە پێچەوانەشەوەبێ •

**جووتەنیی نیشانەکەو پاش‌گرەکە :**

بێجگە لە دەنگ‌گۆڕانێك باری‌لکانو نێوبڕ بە هەمان دەستوورە کە لە ئاخاوتنی ـ موکریو بابانی ـ دا خۆی چەسپاندوە ، وەك :

( هات + گە + س + ەو ⟵ لە باتی : هات + وە + تـ + ەوە )

ئەم نێوبڕەش ئەوەمان بۆ دەردەخاو گومان دەسڕێتەوە کـــە بزوێنە بـەرایی ،پاش‌گرەکە زێـدەبێ • چونکە لە ئاخاوتنی موکـریو بابانیـدا بیانوومان بەوە دەگرت بێتو نێوبڕ ساز نەدرێ و بزوێنـە بەرایی تێبچێ ، ئیلتیباس روودەدا ، لـە نێوان رابوردووی نزیـك و رابوردووی رەبەقی دووبارەدا یان دوابڕگەی / وە لە نێوان دووکـــاردا بە ( وە / ی کراوەی عەتف ، حەلێب‌دەبێ وەك بنووسین :

( گەراوە = گەڕایەوە ، هاتوەتەوە نووســـتوە ، ببێ بە ـ هاتوە وە نووستوە • وەك ـ هات وە نووست ـ ) •

بەڵام لە دەستە شێوەکانی گۆرانو ئەردەڵاندا ئەو ئاڵۆزکانە بەرپـا نابێ ، وەك بڵێین ( هاتگەوە ، هاتگەو = هاتگەســـەوە ) چونکە پاش‌گرو نیشانەکان لێکدی جیان •

تێوبڕی ( س ) بنجێتیی بزوێنی « ە » ی هەردوولا دەسەلمێنێ •

لەلایەکی دیکەشەوە ڕێزگەی ( هاتگە ) بەرپەرچی ئەو رایانەیە کە دوو فۆرمی بنجییان بۆ نیشانەیەك سازداوە :

١ – ووە ، ٢ – وە • / و – ی یەکـــەم نیمچە بزوێنـــەو مـافی ئاشکرابوونی نیەو دەوری فۆنێم نابینێ •



# خشتەی ژمـارە

## « ٣ »

| بابانی | موکریانی | سۆرانی | ئەردەڵانی | جۆری مۆرفێم |
|---|---|---|---|---|
| [ ەوە ] | [ ەوە/وە ] | [ ەوە/وە ] | [ەو/ەوە] | ← دووبارە |
| [ ەوە ] | [ ەوە/وە ] | [ ەوە/وە ] | [ ەو ] | ← پاشکۆئامراز |
| [ وە ] | [ ڕا ] | [ ڕا ] | [ ەوە ] | |
| [ وە ] | [ وە/یە أ ] | [ یە / یت ] | [ گـە ] | ← نیشانە |

[ وە + ت + ەوە / بزوێن + یـ ، ر + ەوە ← بابانی •

[ وە + ت + ەوە / بزوێن + یـ + ەوە ← موکریانی •

[ گە + س + ەو / بزوێن + ر + ەو / ۆ ← ئەردەڵانی •

**تێبینی :**

وەك تایبەتی شێوەو دەســـتە شێوەکـــان ، خـرانـــەوە بـەرچاو ، دەیانکەینەوە دەستەبەری لێکۆڵینەوەکەمان لە شێوەکانی دیدا •

* بەگشتی ئەو گۆڕانە دەنگانەی کە لە ئەردەڵانیدا ، بەراوردم تێداکردن ، لەم هەوارگەیەشدا دەنگ دەدەنەوە لەگەڵ کەمە جیاوازییەکو شەقلی تایبەتی بەچاو مۆرفێمەکانەوە .

**یەکەم ـ مۆرفێمی دووبارە :**

أ ـ بە دوای دەنگدارەوە ، وەك :

« کوێستانان خاڵخاڵ بەفری ناچێتۆ
قیبلەم تۆریاگەو ئاشتی نایێتۆ »
« فۆلکلۆر »

وەك دیاردەیەکی زەق ـ بە تایبەتی لە جافیدا ـ تێکڕای [ ەوە ] بە بزوێنی / .. ۆ / دەشکێتەوە . بەرەواتر لەم بەندە فۆلکلۆریە جەفەنگیەدا ، کە دەگوترێ : « شیرە گەورەی باوەگەرەی تۆجار شکیاگی تۆجار پێچڕیاگی کۆڵەکە نەوڕی توێسی پەڕێن ⋙⟶ ها .. دام لە قەدمو کەفتینە ئەو جەوەڵو کێفە ، هەر ئەوەنگەم ئاوزا شتێ لە گەوتێکا وتی خێو = Xiö ـ ساقما و باقما ساتانم پڕکرد لە ( .... ) خاس بی نەترسیام وەلێ بیۆرمۆ »(٨٤) .

(٨٤) ئەگەر تاڵ وێژیشی تێدا بەدیبکرێ بە ئەمانەتەوە لە ( حەمەپنە ) ناوێك وەرمگرتوە ، کە شوانە کوردێکی نەقلبازبوو ... ئەمە بەندێکی ئەو سەرگوزەشتەیەیە و لەبیرم ناچێتەوە .

دەربڕینی « بیورمۆ » = Biürmo هەر لە دەمی خۆیان شیرینە .. دیفتۆنگی iü .. ـ سەرومڕی تورکیو کرمانجیی سەروو و ئێلاتە کوردەکانی گەرمیانو شارەزووره . لە نووسینی باودا ناپێویستەو بابەتی فەرهەنگستانە .

دەقی [ بوردمەوە ] یەو ئاشکرایە(٨٥) •

ب ـ بە دوای بزوێنەوە ، وەك :

— « پارەکەم دۆزی / وۆ » •

— « لالۆم گەڕیا / وۆ » •

واتە ـ و ـ ی دەنگدار + ۆ ـ ی بزوێن لەسەر کێشی بڕگەی ( کۆ ) ئەو بڕگە خاوە هەرچەندە لە شکانەوەی [ ەوە ] وە ســـەری هەڵداوە ، بەڵام بە هەمان کرکەو دەنگدانەوە ( و ) ی بەرایی ( وۆ ) دەبێتە نێوبڕ ؛ لەم بۆچوونەمەوە نێوبڕێکی دیکەش : و/ی کۆنسۆنانت سەریهەڵدا !!

ئەو جۆرە دەربڕینانە وەك تایبەتی دیالێکتەکە خرانە روو ، دەنا هــەر لەسەر ئاهەنگی دەستە شێوەکانی پێشوو لێرەشدا بەگوڕە ، وەك :

أ ـ بە فۆرمی ( وە ) و بــەدوای بزوێنــەوە • وەك لــە موکــریو سۆرانیدا ، کنەیتێداکرا لە گۆرانیشدا بزوێنە بەرایی تیدەچێ :

« هەرکەس جــەواوی داوە ، ئـامـادە
دەرسەعات قەوری دەوێ گوشـــادە »
« عەقیدەی مەولەوی »

---

(٨٥) لە گەشتێکمدا ، بە نیازی تۆمارکردنی بابەتی فولکلۆریو لە ١٩٧١ ـ ١٩٧٢ ـ دا ، گۆکردنێکی تایبـــەتی ـ لەناوچەی قــەرەداغ ـ گوێی تەقاندمەوە ، کە دەربڕینی ئەو مۆرفێمەیە لە نێوان [ ەو ] و [ۆ] دا ، واتـــە ئەو [ ۆ ] یـــە بــەخــاویو هــۆڕاقی دەنگی پیدەدەنـــەوە . هەر ئەوەندەم بۆ لوا کە بەم چەشنە رێنووسی بکەم ، وەك ( هاتۆو ) بە ویستە لەسەر دەنگی ( و ) ی مەند .

بەلای منەوە سواوەی [ ەو ]ی شێوە ئەردەلانیەکەیەو دووڕەگە لە نێوان گۆرانیو ئەردەلانیدا .

بۆچی دەربەستی تێچوون نیە ؟ ئەگەر چەند هۆیەکی دیکەش هەبێ ، پتر بۆ ئەوە دەچم کە ئاڵۆزیی لەگەڵ نیشـــانەکەدا پەیداناکاو هاوقەبارە نابن‌و ئەمیان بە « گە » خۆی دەپارێزێ ، هەمان سـەرچاوەی پێشـــــو ، لاپەڕە ـ ٩ ـ کە دەڵێ :

« لـە ئاسمان وا پـڕ وێـســـاگە
ئەوەنەی پێ داێیی جیگە نەماگە »

ب ـ لە فۆرمی [ ەوە ] دا و بە دوای دەنگدارەوە ، وەك :

« وە شـــــنەی شەماڵ نەپەخشـــێتەوە
هەرتای سەد رەنگ نەوەخشێتەوە »(٨٦)

**دوەم ـ نیشانەی « گە » :**

لـە رووی گەردانەوە ، هـەروەك « وە » یە کــە لــە بابانیــدا = شارباژێڕی ـ شیمکردەوە :

أ ـ هاتوە ، هاتگە .. هاتوم ، هاتگم .

ب ـ خواردومانە = خوارد + گ مـان ە .

وەك دەردەکەوێ لە لوڕیو هەندێ ئاخاوتنی خانەقیدا ، لە گەرداندا جیاوازیی پەیدادەکاو جێگەی لەقەو پتر بەرەو کرمانجیی ســـــــەروو بادەداتەوە ، واتە بە « یە .. » دەشکێتەوە .

**سێیەم :**

چۆن جووتە دەبەستن ؟

هەربەو چەشنەیە کە لە ئەردەڵانیدا ، روونمکردەوە ؛ بۆ پاراستن و

---

(٨٦) دەنگی گێتیی تازە ژ ٥ ب ٤ ـ ١٩٤٥ ل ٤٣٣ . ســــــەید محەمەدی جەباری ، شاعرێکی نەخوێندەواربووە .

ترازاندن تێوبڕی « س » وەردەگرن ، وەك : ( ناکـە هات + گە + س + ۆ ) •

دەبێ لەوەش بەئاگابین کە بەتاوی موکری‌و بابانی لـە ئاخاوتندا ، تێوبڕی ( س ) ی لەمـەڕ خۆیـان دەکـەنـەوە بـە ( ت ) وەك ( هاتۆتۆ ) بەسوانەوەوە •

ئەم سەودایە لە تێوان تێوبڕی ( ت ، س ) دا پشـــوویەکی دەوێ‌و لێی‌دەوەستم •

**چوارەم :**

پاشکۆ ئامرازەکە لـە سەرتاپای شـێوەکاندا ، هەلاّلەیەکەو بەرامەی خۆی بەرنادا ، جارێ هەر ئەوەندە ڕێگە بەخۆم دەدەم :

بە هاوتەریبی لەگەڵ پاشگرەکەدا لە کۆچ‌و ڕەودایـە ، لـە مەڵبەندی گۆڕاندا پتر برەوی هەیە تێکڕا لە جووتە مۆرفێمەکە پتر خۆی دەپارێزێ• ئەوەش بەدی‌ی‌دەکرێ کـە لـە جافی‌و ئەردەلاّنیـدا بزوێنـە دواینەکەشی تێ‌دەچێ ، وەك :

( پێولکان = پێوەلکان ، تێوگلیان = تێوەگلان ) ••



## — ١ —

— مۆرفێمی دووبارەو رابوردووی نزیك لە چەند نموونەیەكدا :

١ ـ بە دوای چاوگەوە :

سووتەی + ۆ = سووتەیۆ
لوای + ۆ = لوایۆ ...
كوشتەی + ۆ = كوشتەیۆ .

ۆ = ەوە ی دووبـارە

٢ ـ بەدوای رابوردووی كۆتایی بە « ا » دا :

| رەبەق | نزیك | دووبارە | نزیك + دووبارە |
|---|---|---|---|
| ئـامـا | ئاما + ن | ئاما + وە | ئاما + ن + ۆ = ئاماتۆ |

مۆرفێمەكان : «ن» / ۆ ، وە / ن + ۆ = وە + ت +ەوە

٣ ـ كە كۆتایی بە بزوێنی « ا » نەبێ :

| رەبەق | نزیك | دووبارە | نزیك + دووبارە |
|---|---|---|---|
| شكەفت | شكەفت + ەن | شكەفت + ۆ | شكەفت + ەن + ۆ |
| ووت | ووت + ەن | ووت + ۆ | ووت + ەن + ۆ |
| واردم | وارد + ەن ـ م | واردم + ۆ | وارد + ە ن ـ م + ۆ |

مۆرفێمەكان : ەن / ۆ / ەن + ۆ = و .. ە + ەوە

٤ ـ به دوای داخوازیەوە :

أ ـ لوه ⟵ لوەوۆ = Liwe wo .

ب ـ لوه ⟵ لوۆ = Liwo .

جـ ـ ماڵەش ⟵ ماڵەشۆ = Maleşo .

٥ ـ لەگەڵ رانەبوردوودا :

أ ـ ملۆ ⟵ ملوۆ = Mil wo .

ب ـ شۆرووش ⟵ شۆرووشۆ = Şoruşo .

---

دیسان به فۆرمی [ ەوه ] ش بەکاری دەهێنن :

« دەورێ‌دەر وه بەزمو پیاڵەوه

ژەنگ‌دڵ وه زاخمەی بماڵەوه »

ـ مەولەوی ـ

## راڤە و بەراورد

**یەکەم :**

مۆرفێمی دووباره هەر بەئەو قاڵبانەی‌که له شێوه جافیدا تاوی سەندبوو ، له هەورامیشدا دەوردەبێتەوه ، لەگەڵ ئەو رەت‌بڵاویەشدا کەمە جیاوازییەکی تێدا بەدیی دەکرێ ، وەك ئاوازدانەوەی دەنگ به [ .. ۆ ]و قفڵدانی لەسەر [ و ] ی مت .. بۆمان هەیە کە بە تایبەتێکی جافی دەست‌نیشانی بکەین ، وەك : ( هاتگەسۆو ) .

زەق‌بوونەوەی به [ وه ] وەك ( ئاماوه ) بارێکی هاوبەشە لە نێوانیانداو بزوێنە بەرایی ـ وەك له موکریدا ـ تێ‌دەچێ .. بەڵام باری

هێنی لەم مەڵبەندەدا ، دەگەڕێتەوە بۆ ناتالۆزکان لەنێوان پاشـــگرەکەو نیشانەکەدا ، چونکە ئەمیان لەسەر بەجافیدا بە « گە » و لە هەورامیدا بـە « ەن » خۆی دابڕیوە • لە موکری و سۆرانیدا ئەو بیانوە بە دەستەوە نیە •

بادانەوەی پاشگرەکە بەرەو هەوارگەی [ ەوە ] لـە نموونەی کۆنو نوێی ئەم لقەدا بە تەوژمە ، وەك :

« حەلقەی کەمەندان جەهوون کەردەوە

بە ئەسرین سـوورمەی دیدەش بەردەوە

« خانای قوبادی »

دیسان لە دەقێکی پەناپەسیوتردا :

« یەخ‌کەر وە عەرەق نەتوویی غەبغـەب
بلووزانـــەوە ـ دانـــە لاڵ لـــەب »

« سەید سادق/دەنگی‌گێتی »

بزاوتنی بڕگە بـە / •• ۆ / لە هەورامیو بەشـەکانی دیدا ، نەرمو نیانی هەیەو وەك مۆرفێم دابین‌کردنی زەحمەتە ، بەڵام کە دەکەوێتە گـەڵ نیشانەی [ ەن ] • خۆی ســـاغدەکاتەوە وەك ( بەســـتەنمۆ پێوە = بەیەکەوە بەستوومەتەوە ) •

« دەروونم لەتـلـەتـا بەســـتەنمۆ پێوە
بسـانێ پەنجەرە •• سوراخ سوراخ »

« صەیدی ـ لێکۆڵینەوەی کاردۆخی »

لەم نموونەی خوارەوەشدا ، دەبینین کە ( ۆ ) پاشگر نیە :

ـ لڤۆ = ڕۆیشـــت ، مەویەرۆ = تێپەڕی ، بوازۆ = بخوازێ ، نەمیرۆ = دەمرێ ••• هتد ـ •

کەچی لە بڕێ شوێندا وا هەڵدەگرێ کـــە بۆنی دووبارەی لێبێ ، وەك :

« ئەرمووی بیللا بە عیســـــــای مــەریـەم
ـ نمەگنۆت ـ هــەنیچ تۆ بــە مــەریەم چەم »
« خانای قوبادی »

کاری ( نمەگنۆت ••• ) دەقی ( چاوت پێی ناکەوێتەوە ) یە ؛ کەسێ ئازیزەکەی بمرێ پێی دەگوترێ : ( ئیدی چاوت پێی ناکەوێتەوە ) ئەگەر شوێنەکەش ئەوە بگەیەنێ ، لێرەدا / •• ۆ / پاش‌گرنیەو سەربەگەردانە •

**کورتە ئەنجامێك :**

مۆرفێمی دووبارە لە دیالێکتی گۆراندا ، سێ قۆناغی بەســـــەردا تێپەڕیوە :

١ ـ تێکڕای [ ەوە ] بووەتە [ ەو ] •

٢ ـ بەکارتێکرانێکی‌کەش بڕگەی [ ەو ] لـە رووی دەنگســـــازیەوە ـ خاوکراوەتەوە بە [ وۆ ] •

٣ ـ دواتر ، وەك بزوێن بە / •• ۆ / سواوەتەوە و خۆی دارشتوە •



**دوەم :**

دەتوانین ـ وەك تایبەتی ئەم لقەگۆرانیە ـ نیشانەی رابوردووی نزیك دەست‌نیشان‌بکەین‌و یەکەم جیاکەرەوەیەتی لە لقەکانی‌دی ؛ ئەو ســـەوداو مامەڵەیەی‌کە تووشی [ وە ] ی نیشانەی دەستە شێوەکانی دی بوو ، هەمان رەفتار لەگەڵ [ ەن ] ناکرێ ، لـە ئاخاوتنی هــەورامی‌و زەنگنــەدا •• بــە سەرنج‌دانی نموونەکان دوو روخسار بەدەست دێ :

آ ـ ٠٠ ن ⟵ ئامان = ئاما + ٠٠ ن ٠

ب ـ ە ن ⟵ کەردەن = کەرد + ەن ٠

ئەگەر دەستبەرداری بزوێنەکەشی ببێ ، دەست لە بەشی [ ن ] هەڵناگرێ‌و دەستوورێکی گشتیی‌و باوە :

« پەژارەت شادیم جەبێخ ئاوەردەن
دووریت ریشەی دڵ خەیمەکەن کەردەن »

« مەولەوی »

وەك لە بەراوردەکەوە دەرکەوت بە دوای بزوێنەوە تەنها دەنگی (ن) دەمێنێتەوە ، بەڵام لە هەندێ نموونەی دیداو سەربە هەورامی ، ئەوەم بە چاو هەڵەنگوت کە بە دوای دەنگداریشەوە بزوێنەکەی تێدەچێ ، وەك لەم فەرمایشتەی مەولانا خالیدی مکایەڵیدا :

« کارێ پێم کەردن مەحرووی رازت
نەکەردن وە دڵ نیم‌نیگای نازت »

« دەنگی گیتی ، ل١٤٤ »

لەپشکنین‌و لێکۆڵینەوەی زماندا ، کار بەچەند نموونەیەك مەیسەرنابێ‌و دەستوورەکە لەسەر ، تێکڕای « ەن » دامەزراوە(٨٧) ٠



(٨٧) قالبی « ەن » وەك راناوی رستەناو = رابطة الجملة الاسمية ـ یان بەلای هەندێکەوە کاری یاریدەدەر = ڤیرب توبی ـ دیاردەیەکی ئەو بەشە دیالێکتەیە :

« مەر جەستەی خەستەی من جەفۆلادەن
بەند دووریت وینۆ ، هیمان دڵ شادەن
ـ مەولەوی ـ

# — ٢ —

## پاشکۆ ئامرازی پەیوەندی

بە سەرنجدانی نموونەی کۆنو نوێی هەورامی هەر بە ئەو روخسارەیە کە لە موکری‌و بابانیەکەدا لێیم کۆڵیەوە ، کەواتە هەرێمی شـــــارەزوور ، بووەتە هۆی بازدانێك و مامەڵەیەکی تایبەتی‌ی لەگەڵداکرد ، بـەڵام لـــە هەورامی‌و زۆرینەی لقەکانی دی‌گۆراندا ـ خۆی دەپارێزێتەوە بۆشاییەکەی شارەزوور کارناکاتە ئەو خۆ گیرسانەوەیە • چەند نموونەیەك :

« ئـامـام نـەڕات پی‌جەســـــــتەوە
گیرەم ســـلۆم چیت نەستەوە »

« صەیدی »

لە ـ جەستەوە ـ دا ، پاشکۆی ( پی ) بـە دوای دەنگدارەوەیەو بـە تێکڕای [ ەوە ] یە ••• بە هەمان قەبارە بەدوای ـ نەستەوە ـ دا پاشگری دووبارەیە •

یان وەك :

« عیفـریت ئـەجـــەل نـە رووی پـەردەوە
پف‌کەر بـە شـــەوقش ، خامۆش کەردەوە »

« خانای قوبادی »

لێرەشدا لەگەڵ پاشگرەکەدا هاوفۆرمە •

بە هەمان رەفتاری لەمەوبەر کـە بەدوای بزوێنـەوەبێ ، بە [ •• وە ] دێتە گۆڕێ ، وەك :

« دەروونم لەت‌لەتا بەستەنمۆ ـ پێوە ـ »

پێ + ەوە = ێ + ە ⟵⟵ پێ + وە •

هەندێ جار بە فۆرمی [ ڤە ] لـە ئاخاوتنی کۆنی هەورامیدا ، بەدیی دەکرێ وەك :

« ریـۆن داخـۆ بـالآ تـەڤـە[88]
هـــــەزاریـــۆ دەردەدارەنـــێ »
« صەیدی »

● لە روانگەی ئەم شیعرەوە :

دەستەواژەی «داخۆ بالآ تەڤە» لە هەورامیی کۆندا ، سیخورمەیەکمان تێدەسرەوێنێ کە بەڕووی هەندێ فەلســـەفەگەراندا بشـــــــریخێنین : ـ گوایە لقی هەورامی ، لە رووی گرامەرەوە لە کوردی دابڕاوەو زمانێکی سەربەخۆیە !! هەر ئەو دەستە واژەیە لەباری رستەســـازیو مۆرفۆلۆژیدا چمکێکی مێژووییمان بۆ هەڵدەداتەوە •• بەرەوکرمانجیی سەروو ، بەشی [ زازا ] ئاورێکمان پێدەداتەوە ، لـە وێشـــەوە هۆمان پێدەداتەوە بەرەو کۆچورەوی هەوارگەی هەورامان •

❋ ئەم پرسیارە : نیشـــانەی [ وە ] و [ گە ] یەکنو کـــەمـــە دەنگ گۆڕانەکەش رووداوێکی ئاساییە •• بەڵام ساغکردنەوەی [ ەن ] لە هەورامیداو سەودای لەگەڵ [ وە ] دا چۆنە ؟

شارەزایانی زمانە ئێرانیەکان ، دەتوانن کنـــە لـەم جـۆرە دیاردانـەدا بکەن ؛ لەم بارەیەوە ئەوەندە دەسەڵاتدارنیم • ئەوەی لـە وزەمدابێ تازە گەشتێکە لە بەشـــــە دیالێکتەکاندا •• بۆ هەمان مەبەستیش لـــە لوڕیو فارسیدا ، ســـــــەرە تاتکەیەك دەکەم ؛ کەواتـە با جارێ لە ئێرەدا بۆی بوەستین •

★

(88) رێون = ریحانە . داخۆ بالآ تەڤە = لە داخی بالآی تۆوە .
دیوانی صەیدی ـ ل ١١٥ ـ م / کاردۆخی .

* به ئەو چەشنەیەی کە لە ئەرکو روخساری ئەو سێ هەڵاڵەزمانیە دوام ، لە لوڕیو فارسیدا ئەو تەوژمە دیاردەیە بە دەست ناهێنین[89] بە تایبەتی لە ئەرکی رووداوی شێنەییدا و لە فارسیدا ـ بۆ دووبارەکار پشت بە پارچە وشەی لێکدراو دەبەستێ .. ئەو تەوژمە ناسکەو بە مۆرفێمی تایبەتی ، مۆرکی کوردیەکەیە ؛ چ نهێنیو سەمەرە لەوەدا نیە کە بۆ دووبارەو گەڕانەوە لە فارسیدا دەگوترێ :

١ ـ « توتی سخنرا دوبارە میکند »

واتە : توتی قسە دەگێڕێتەوە .

٢ ـ بازآمدن .. باز خواستن ... هتد »

کە بە هۆی پێشگری « باز » ەوە ، مەبەستی دووبارە بەدیی دەهێنن !

تەنها بە ئەمەندەو بۆ بەراوردکاری مەبەست ئاشکرا نابێو ئەنجام نەکامڵ دەردەچێ .

دوای ئەوداڵی ، چەند دەقێکی زمانەوانیو هەندێ نموونەی پەناپەسیو ، دەکەمە دەستەبەر بۆ روونکردنەوەی ئەرکی ئەو مۆرفێمە ..

(٨٩) تێکەڵکێشیان تەنها لەبەر ئەوەیە کە فارسیەکە باش‌باش کاری لەلوڕیەکە کردوە ، بە تایبەتی لە هەڵکەوتی نیشانەی کاری رابوردووی نزیکدا .. دەستە شێوەکانی لوڕی لەگەڵ لقەکانی گۆراندا و لەو مۆرفێمانەدا ، بە یەکدا دەچنو ئەوە دەسەلمێنن کە ـ لوڕی ـ لە بڕبڕە پشتی تاقە زمانی کوردیەو سەرجەمیان لە فارسی جیادەبنەوە.. لایەنی سەربەخۆیی هەردوو زمانەکەو هاوخێڵییان لە لایەکی دیکەوە ، لەم بەراوردەدا دەردەکەوێ .

## — ١ —

## لــه فارســــيدا

أ ـ « پیشاوند ـ وا ـ نیز که معنی عقب‌و باز ، یعنی دوباره‌و مکررو بروعلیه بمدخول خد میدهد ، در ترکیب افعال دیده‌میشـــــود مانند :ـ وا گفتن ، وا خواستن و چند فعل دیگر .. »(٩٠) .

ب ـ « وا ـ : پیشوند که در أول برخی کلمات در می‌آید ، معنی بازو دوباره‌و برو مکرر میدهد ، مانـــد :ـ وا گزاریـدن ، وا گفتن ... بمعنی بازو گشوده هم میگویند ؛ واکردن : بازکردن .. گشودن » .

« فرهنگ عمید »

**بەشـــوێن‌کەوتن :**

پێشگری « وا » له فارســـيدا ، هەمان مۆرفێمی « ەوە »ی کوردی دەگرێتەوە . به قسەی ئەوان ، ئەو پێزو برِشـــتەی نیه ؛ کـه گوتیـــان :

« ١ ـ در ترکیب افعال دیده‌میشود .

٢ ـ در اول برخی کلمات درمی‌آید » .

له لایەکی‌دیکەشەوە بە لێ وردبوونەوەی زمانەکەیان ـ دەی‌سـەلمێنن کە بێ تەوژمە .

---

(٩٠) دستور جامع زبان فارسی . کتاب اول ص١٣٦ اســتاد ( عبدالرحیم همایونفروخ ) .

● دوای سەرنج‌دانی چەند بەشێکی ئەو کتێبە ـ کە بە بیست‌و هەشـــت ساڵ دای‌ناوە ـ بۆم دەرکەوت کە نووسەر باوەڕی بە دیالێکت‌و زمانی کوردی نەبێ‌و هیمای بۆ ناکا . بێجگە لـە زمانە ئەدبیەکەی خۆیـان ، ئەوانی‌دی بە ( عامیەی فارسی ) ناو دەبا .

هەرچۆنێك بێ جەمسەرێكمان دەستدەكەوێ ئەوەندەی لەوان نەبانە پتر هۆگری كوردیكەی لەمەڕ ئیمەیەو دێرینە دیاردەیەكی زمانە ئێرانیەكانە ، ئەگەر سەردەمێكیش برەوی بووبێ لە فارسیی ئێستادا ، بە وشـــــەی ( باز ، دوبارە ، هَم •• ) چرووساوە ، ئەركە سەرەكیەكە : ( روودانی كار بە خاوی ) لە رشتەی ئەو زمانەدا بە دەگمەنە[٩١] •

وای بۆ دەچم كە پتر سەر بە ( پەهلەوی ) و كوردی بێ •

**نیگایەك :**

لە قوناغی یەكەمدا لە وە دوام كە ( دە نەبەز ) ســـۆراخی ئەوەندەی كردوە ، لە شێوەی گیلەكیدا وشەی ( ڤەكۆن = بكەرەوە ) بەكاردەبرێ ، گوتی : ساغ نەبووەتەوە كە ئەو شـــێوەیە ســـەر بە چ خێڵە زمانێكی ئێرانیە • بەلام لە فارسیدا هیچ سۆراخێكی نەكردوە •



## — ٢ —

## لــە لوڕیدا

پێشەكی : پاشگرەكە بە روخســاری [ ەوە ] لە دەقەكانی نێوەندی هەرێمەكەدا ، بە دەگمەن خۆی دەدابەدەستەوە • بۆ مەبەستی دووبارە لەســـەر تەرزی فارسیـەكەیەو لە میاندا بۆ خاوبوونەوەی كار : ( قــەدی

(٩١) رێژگەی « واكردن = گشـــودن = والاكردنەوە ، رەوێنەوە » لـە فارسیداو « واكەرە = بكاتەوە » لەلوڕیدا ، سەرهەڵدانی روودانـە شێنەیەكەیەو بەلام لە مۆرفێمی سەربەخۆی « وا » دەردەچێ‌و دەبێتە پاشماوەی باز = واز = گوشادبوون = رەوینەوە .
بەلام بۆ ئەركی دووبارە ، مۆرفێمەكە سەربەخۆیەو ســـــــاوەی « واز » نیە . ئالانی

چاوگ + ە ) دێ بەدەستەوە ، وەك : ( پوقسە = تەڤینەوە ) •

ئەگەر لە گێژی خانەقیو گەرمیانەوە بۆی دابکشێین ، هەست بە تێچڕانێك دەکەین لە نێوان لقەکانی گۆرانو شێوە لوڕیەکەداو ، ئەم کارتێکرانەش رووداوێکی ئاساییە •

بۆ هەمان مەبەستو سۆراخ ماوەیەك گوێم هەڵخستەوە و چەند رستەو پەرەگرافێکم بە دەنگو نووسین تۆمارکرد • بە نموونە :

١ ـ « توام چمەو ئەڕای قەومیلەکە » •

٢ ـ « چمەوە ئەڕای کوڕیلەکە » •

ئەم دیاردانە کێشەیان لەسەرنیە ، ئەوەی سەرنجی راکێشام ئەم دەربڕینەبوو •

٣ ـ « توام چمەوا ئەڕای ماڵ » •

لەم رستەیە دڵنیابوومو هەر ئەو دیاردەیەیە کە لە فارسیەکەدا دەرکەوتو بەڵام لێرەدا ، وەك پاشگر خۆی ساغ دەکاتەوە • بە دووریشی نازانم کە ( چمەوا ) دەقی ( چمەوە ) بێو لە ئاخاوتنی ئەو هۆزەدا ، ئاوای بڵێین •

ئەگەر بە کزیش بێ لە باری مەسەلەکە ناگۆڕێو بۆ بەڵگەکاریو ئیتمۆلۆژی ، رێگەیەکمان بۆ روون دەکاتەوە •

چەند دەقێك :

أ ـ لە مەڵبەندی نێوەندا[٩٢] :

(٩٢) نموونەکانی یەکەم تا چوارەم ـ بە بێ شیکردنەوەی رێزمانی ـ بۆ ئەم سەرچاوەیە : ( فەرهەنگی ـ لەك و لوڕ ) دانانو کۆکردنەوەی ( حەمید ی ئێزەد پەناه ) . بەراوردکردنی ( مەحموود زامدار ) چاپی ـ ١٩٧٨ .

١ ـ وه : به ، لەگەڵ = بـا = فارسی ، لێرەدا پرپێۆزیشنەو لـــە فارسی دادەبڕیو دەستەملی شێوەی گۆران دەبێتەوە •

٢ ـ وا : واز ، وابییە : کردنەوە = بازشدن •

٣ ـ واچوگە : کولانەوە = زخمی در أثرفشار •

٤ ـ وایەك : بەیەکەوە = بایەك •

بە گۆڕانی : وە = بە ←<<<< پرپێۆزیشنە •

٥ ـ واز گوفتکەردە = باز گۆکردن •

٦ ـ « ئەگـەر قەســـابەم ئەزتـەن واکەرە پوســـــت

جودا هەرگیز نەکەردە جوونـەم ئـەز دوســـت »

« بابا طاهر »

ــــ کاری ( واکەرە ) مەبەستی ( کردنەوە ) دەدا بەدەســـــتەوەو ( نەکەردە ) ش دەقی ( ناکاتەوە ) یە •

ــــ کە مۆرفێمی « وا = واز » لـە لوڕیەکەدا زەقترە تـاوەکـــو فارسیەکە •• ڕێگە لە سەربەخۆیی « وا » ناگرێ بەتایبەتی کە پاشگرێ‌و لـە مەوبەر نموونەیەکم هێنایەوە • ئەگەر لێڵی لەو نموونـانـەدا بەدیی بکرێ ، گومان لەوەدا نیە کە مۆرفێمی دووبارە بـە تێکڕای [ ەوە ] لـە لوڕیدا چەقی خۆیدەگرێ‌و ئەو کۆنە هەوارە لە زەمینەی دایکە هەواری کوردیدا ، ئاوەکیناکا •

٧ ـ « چیو حەسرەت مەنان پەی شـاد بیومەوە

چیو وەفـــاداران دەحیــــا پیمەوە »[٩٣]

---

(٩٣) آقەی ئازادە شوحانی ـ کـەڵهـوڕ ـ . دەنگی گێتیی تازە / ب ٢٦ ل ٥٤٧ .

**بەکورتی :**

١ ـ وەك پێشگرو بـە فۆرمی « وا » لـە فارسیو لوڕیدا دیـاردەیـەکی دێرینــە •

٢ ـ وەك پاشگر لە لوڕیدا بە هەمان ئاواز جەمسـەری هەیە •

٣ ـ بە [ ڤە ] لە گێلەکیدا بەدیی‌دەکرێ •

٤ ـ بە تاوی شێوەی گۆرانو هەر لە لوڕیدا دەسوێتەوە بە / •• ۆ /

٥ ـ بە تێکڕای [ ەوە ] بەرەو دایکە زمانی کوردی دەبێتەوە •

٦ ـ بێ‌پێزیی لـە فارسیداو گوڕبەســـتنەوەی لە کوردیدا چمکێکی مێژووی هەڵدەداتەوەو ســــەربەخۆیی‌و دێرینێتیی زمانی کوردی دەسەلمێنێ •



★

## ـ ٣ ـ

### نیشـانەی رابوردووی نزیك

**ا ـ چەند نموونەیەك لە لوڕیدا :**

١ ـ « درەختی غەم بە جانەم کەردە ڕیشــــە
بــە دەرگاهی خودا نالــەم هەمیشــــە »
« بابا طاهر »

٢ ـ « دەســـت برد ئاوینەی بەدەن ئەو ناز
کردەش ئەو روو روو بەیزایی نیم‌بەیاز »(٩٤)

---

(٩٤) قولی کاکاوەن / بە شێوەی لەك . دەنگی گێتیی تازە ، ژ ـ٥ـ ب ٤ ـ ل ٤٣٨ .

٣ ـ « شوری بەسەرم کوتەگە لـــەم مەســـــتی چاوە
هیچ جێگەی نانیشم مەگە ئەم جێ کە شەراوە ...
« ماچـان کـە غەزالان چەڕنی شـــــــۆرەزەمینە
بەس ئاهوی من جیش کـە لـەم دیدە رماوە »[٩٥]

٤ ـ لە تێکەڵەی هەرێمی گەرمیاندا :

ـــ گرتمەیان = گرتومن
ـــ گرتنـەم = گرتویانم
ـــ خواردمە = خواردومە .

٥ ـ لە بەرهەمی تازەدا :

« بەشی لـەێ ژینـە خـۆڕیـاگـە
دڵی وەی دەردە ســووزیـاگـە »[٩٦]

سەرتاپای ئەو نموونانە ئەوە دەدەن بەدەستەوە کە نیشـانەکە ـ وەك دیاردەیەکی ئـــەو دیـــالێکتە ـ بریتیبێ لـــە بزوێنی / .. ە / ، وەك : « کەرد + ە = کرد + وە ، کرد + ە ـ ش = کردویە » .

دیســـان بە فۆرمی « گە » لە ئەدەبیاتی کۆنو تازەیـانـدا ، تـاوی سەندوە ، وەك :

« کوتەگە = کەوتوە ، سووزیاگە = سووزیاوە » .

---

(٩٥) گەلاوێژ ، ژ ـ٦ـ سـاڵ ـ ٥ / ١٩٤٤ ل ٢١ . ( سی یاقو مایەشتی / ناردنی ـ ید الله رضـائی :
« ئێمەی قەســـیدەی ـ خوارەوە ـ کەیمەنەی وە یەکەمین نموونـە قەسائید سی یاقو ، وە خەیمەنـەی وەرچوە خونەوارانـە گـەلاویـژ گیـان » .

(٩٦) ئای چەندم خۆشدەوێ / ل٣٦ ، چاپی ـ ١٩٧٩ ـ محەمەد بەدری .

ئەم دیاردە گۆرانیە تاوی‌کردوەتە سەر لوڕیەکەش • بەهەمەحاڵ فۆرمە گشتیەکە « وە » لەوێشدا دەبێتەوە بە ئاڵقەبەستی سەرتاپای شێوەکان ، بەهەمان سەوداو میانە لە فارسی دادەبڕێ •

چونکە لە فارسیدا ، بە بزوێنی / •• ە / خۆی دەردەخاو پسانەوەی بۆ نیە ، واتە کارەکە چەندە لەگەڵ راناودا گەردانی پێبکرێ ناپسێتەوە ، رێژگەکارەکە وەك ئاوەڵناوی بەرکار دەدا بەدەستەوە ، ئەمەش چەند نموونەیەك :

« باران رحمت بیحیسابش همەجا رسیدە •
قەبای سبزورق دربر گرفتە »[97]

ب ـ بۆ باری دڵنیایی ئەمەش چەند دەقێکی رێزمانی :

أ ـ « ماضی قریب أو النقلي ـ وکیفیة تکوینه : أن تلحق هاء صامتة بآخر المصدر المرخم ثم تضاف بعد ذلك الرابطة ـ ام ، است ••

ب ـ « مصدر مرخم + ە + رابطة[98] •

وەك : « من کردە ام ، کردستم • او کردە است ، کردست • خواستە ام » •

---

(97) گولستان سعدی . ص٣ . طبع نعمان الاعظمي . لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا نووسراوە : ( همەجارسیدە ـ هائی مفعول .. ای ـ همەجارسیدە شدە .

(98) القواعد الاساسیه لدراسة الفارسیة . الدکتور ابراهیم امین الشواربي .

# — ٤ —

## پاشکۆ ئامراز لـەم بنەیەدا

بە فۆرمی ( ەوە / وە ) لە لوڕیشـــــدا ، زەق‌و نمایانەو ژێر ڕکێفی تـەوژمی فارسی نـەبووە • وەك لـــە کـرمـانجی‌ی ســـەروو زوربەی دەستەشێوەکانی نێوەراســـتدا ، بە ( ڕا ، را ) دەشـــکێتەوە ، وەك : ( کورابشم = لە کوێوە بڕۆم ) •

بەهەمان فۆرمی رەسەن لێرەشدا بنەی خۆی دەخاو دەگوترێ :

« مایـلبی ویی جامجیم سـیمەوە

مـالآ وە گۆنـایی گوڵ ئـەدیمەوە

« قولی کاکاوەن »



## خشتەی ژمـارە

« ٤ »

| گۆرانی | هەورامی | لوڕی | فارسی | مۆرفێم |
|---|---|---|---|---|
| ۆ<br>و ۆ<br>ۆ و<br>« ە و ە » | ۆ<br>و ۆ<br>و ە<br>« ە و ە » | وا<br>ۆ<br>( .. )<br>« ە و ە » | وا ؟<br>باز<br>دوبارە<br>« .. » | مۆرفێمی<br>دووبارە |
| گە<br>« و ە » | ە ن<br>ن<br>و ە | ە<br>گە<br>وە | « ە »<br>. .<br>. . | نیشـانەی<br>رابوردووی<br>**نزیك** |
| ە و<br>ۆ<br>« ە و ە » | و ە<br>ڤە<br>« ە و ە » | وە<br>ڕا<br>« ە و ە » | ( . . )<br>( . . )<br>( . . ) | پاشکۆی<br>ئامراز |

بۆ سەرنجدان :

١ ـ نیشانەی رابوردووی نزیك بەگشـــتی لەکوردیدا ، لـە فۆرمێکی پێكهاتو لە ( دەنگ + بزوێنی ـ ە ) بێجگە لە لقی هەورامی کـــە بە پێچەوانەوەیە : ( بزوێنی ـ ە + دەنگ ) •

٢ ـ لە فارسیو نێوەندی لوڕیشدا ، بریتیە لە ( بزوێنی ـ ە + رانـاو ، یان بزوێن ) •

٣ ـ ئەگەر لـە هـەنـدێ ئاخاوتنی کوردیـدا بزوێنـەکـە « ە » تێ بچێ دەستبەرداری بەشە دەنگیەکەی نابێ ، بەتایبەتی لە هەورامیـــدا ، وەك : ( کەردن = کەردەن = کردوە ) • مانـەوەی دەنگی ( ن ) و تێچوونی بزوێنی ( ە ) رێگەبەوەنادا کـــە دەنگدارەکە زێدەبێ و بزوێنەکـە بنجیبێ ، بـە چەشـــــنی زێدەبوونی ( تن ) بـە دوای راناوەوە[٩٩] • ئەو مامەڵەو سەودایە لەگەڵ نیشـــانەی « دن » دا ناکرێ •

٤ ـ دەبێئەو لایەنەش نەشارینەوە کە بەهەمان فۆرم راناوی « ە » لـــە رستەناوداو لە هەورامیدا بە « ەن » بەکاردەبرێ ••• لـە وانەشـــە بە هاوتەریبیی نیشانەکە تەشەنەیکردبێ ، وەك :

« راسـتەن مواچـان فارسی شـەکەرەن
کوردی جە فارسی بەڵ شـیرینتەرەن »
« خانای قوبادی »

---

(٩٩) ئەم دیاردەیە سەر بە کرمانجیی سەروو و سۆرانیە ، جێگەی لەقەو بێبایەخە ، لەبەرئەوە بە بەشەراناوی چالاکی دانانێمو نایئنووسـم ، دیسان بەسەرنجدانی ئەدەبیاتی پێشو لە مەڵبەندی ســـــلێمانیداو بەکزی دێتەبەرچاو :

« زەمانـە بەعـزە کەسـانێ لەپڕ کە هەڵدەبڕێ
ئەوەندەی [ هەڵدەبڕێتن ] هەتا لەکەل دەبڕێ »
( مەحوی )

ە ـ هەمان روخساری « ەن » لە رستەناوداو بە پێچەوانەوە « نە » لـــە هەندێ باری تایبەتیدا لە کرمانجیی سەروودا لەکاردایە ، وەك :

« دەلیـلێ بـارانێ ـ بـانـە ...
دەلیـــلێ مـرنێ ـ تـانـە »[100]

هەرچەنـدە لێرەدا روالەتی ( ن + ە ) لـەبـەر چاوە ، بەلاّم تەنهـــا بزوێنەکەی بنجیەو دەنگی ( ن ) تێوبڕی جووتە بزوێنە ، ئەگەر هەمـــان پەند بخەینەسەر ئاخاوتنە ئەدەبیەکـە ، تێوبڕی ( یـ ) وەردەگرێ ؛ کـــە بلێین : ( ... بایە .... تایە ) لەسەر شەقلی هەورامیکەش ، ئەوابزوێنەکە تێدەچێ ، وەك : ( دەلیلو بارانی بان ... دەلیلو مردنی تان ) .

یان ئاشکراتر :

« سەرعیەن ، شەیدان ، نەجدەن ، مەجنوونەن
مەزاقـەن ، جـامـەن ، پیـالـەی هوونـەن »
« مەولەوی »

دەستەڕستەی ( شـــــەیدان ) ..... کۆ نیـەو بەرانبـەرەکـەی ( شەیدایە ) یە و بەم چەشنە پێكهاتوە : ( شەیدا + ەن ) بەســـەرنجدانی قەسیدەکە باشتر ، دەردەکەوێ : ( وەهارەن ، سەوزەن ، ئاوەن ... هتد .

لـە ئەو دیاردەیەدا بۆمـان دەردەکەوێ کە ســـەودایەك لـە تێوان هەورامیو کرمانجیی ســـەروودا هەیە ؛ لەویاندا دەنگی [ ن ] بووەتە

---

(100) پەندی پێشینیان ، ل ٢٣٤ ، چاپی ١٩٧٦ ، کۆڕی زانیاری ، کۆمەلە تێکستی فۆلکلۆری لە زاری کوردەکانی سۆڤیەتەوە / پرۆفیســـۆر قەناتی کوردۆیێف .

تێوبڕو لە میاندا بەتاوی بوونە نیشانەی کاری رابوردووی نزیك ، بووەتە دواپینەی •

* تێوبڕایەتی [ ن ] لە زمانەکەماندا شتێکی ئاساییە ، ئـەو دەنگە لە وشەگەردانیدا ئەو پەڕی میانەی هەیە ؛ چۆن هاوشانی ( یـ ) تێوبڕدەبێ دەشبێتە جێگری دەنگی ( ر ) لە هەمان ئەرکدا :

« بە مەحزی ئیمتیحان دەستم [ بنێ + ن + ە ] باخەڵت یەکدەم ••• لە بندا بیبڕن رازیم ئەگەر نەمبوو یەدی بەیزا »[١٠١] •



(١٠١) قواعد اللغة الكردية / ص ٣٦ ط ١٩٥٦ / تۆفیق وەهبی •

## — ١ —

چەند نموونەیەك بۆ مۆرفێمی دووبارە(١٠٢) :

١ - « تـەعـین ببویـا ژ بۆ وی تـەختـــەك
ظاهیر ڤەدبـوو ژ بـۆ مـــە بـەختـــەك
« خانی »

یـان :

« سینه بدەست خوە موبارەك ڤەکە(١٠٣)
تعـرف کـم في کبـدي من جـــراح »

---

(١٠٢) مامۆستا جگەرخوین ( آواو دەستورا زمانی کوردی ل ١٨٠ - ١٨١ - ٢٠٥ ) لەم باسە دواوە بەکورتی :

١ - هەرسێ مۆرفێمەکەی لە روخســـاری ( پیتی - وە / ڤە - ) دا نیشان‌داون ، بەبێ هیچ هەڵا ویشتنێك‌و گوایە بۆ سووك زمانی سازدراون .

٢ - بەراوردی مۆرفێمی دووبارەی بە نیشـــــانەی نزیك‌کردوەو بە زیادەی دەداتە قەڵەم .

٣ - ئەویش لە ئاقار جووتە بەســــتنی هەردوو مۆرفێمەکەوە ، بێ‌دەنگ بووە .

٤ - پەنجـــەی بۆ لایەنێکی گرنگ راکێشـــــاوە ، کـــە دەڵێ : « هاوسنووران ، تورك ، ئەرمەن ، فارس ئەسـڵی ( وە ) یـان گۆڕیوە بە ( ڤە ) واتە : دەنگی ( و ) بەکوردانەتر دادەنێ تاوەکـو دەنگی « ڤ » .. لەم لایەنەدا رای - د. نەبەز - پێچەوانەیە .

(١٠٣) لەوانەیە گومان‌ببرێ کە کاری ( ڤەکە ) بەرانبـەری ( بکە ) بێ ، نـەك ( بکەوە ) .. راستیەکەی بەرانبەری دوەمەو نیشـــــانە داخوازی تێ‌چووەو لە موکریدا بە ( وەکە ) و لە بابانیدا بە ( بکەرەوە ) باوە .

٢ ـ « گەپ ژە فەکێ تە ڤەدەرکەت ئیدا توجار ـ ڤەنەگەڕە »[١٠٤] .

« پەند »

٣ ـ هیلین بوونەڤە پیاز = عادَ فقیرا .

٤ ـ دێنـەڤە = واجهە ثانیة .

٥ ـ خڕڤەکرن = خڕکردنەوە[١٠٥] .

٦ ـ ڤەگەڕایە = گەڕاوەنەوە[١٠٦] .

⟵ لە دەستە شێوەی بۆتاندا .

* بە پێی ئەو میسالانە ـ بێجگە لە بادینی ـ لە قالبی [ ڤە ] دا و بە پێشگر دەلکێی بە کارو چاوگەوە ، جا سادە یان لێك دراوبن .

لە بادینیشدا بە فۆرمی [ ەڤە = ەوە ] پاشگرەو لەکاردایە .

مامۆستا جگەرخوین وای دەرخستوە کە لە بادینیدا هەر پاشـگرەو لە قالبی [ ەڤە ] دایە ، وەك پێشگرو لە قالبی [ ڤە ] دا تایبەتی لقەکانی دی کرمانجیی سەرووە .

---

(١٠٤) فۆلکلۆرێ کوردێ ئازەربێجانێ سۆڤێتێ / پرۆفیـــــــــۆر قەناتی کوردۆ ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٤٥
گەپ = خەبەر
فـەك = دەم

(١٠٥) لە موکری‌و سۆرانیدا بە رێژگەی ( خڕەوەکردن ) و لە ئەردەلانیشدا بە ( خڕەوکردن ) ، وەك پێشگر باوە ، وەك پاشگرو بەزەقی لە بابانیدا لەبەرچاوەو دەلێن ( خڕکردنەوە ) .

(١٠٦) ئەوەمان بۆ دەردەخا کە جووتە مۆرفێمی دووبارەو رابوردووی نزیك لە دەستە شـێوەی بۆتانیدا ، سـەروبنی کـارەکـە دەگـرن . بـەم بەراوردەی خوارەوە :
ڤە / گەڕا / یە = گەڕا + وە + ت + ەوە .

یان برێ زمانەوان تاقە [ ڤە ] یەکیان پەنجە نیشـــانکرد ، بۆ هەموو دیالێکتی سەروو !!

من لەگەڵ رای هیچیاننیم ؛ چونکە لە ئاخاوتنی بادینیدا ، وەك لــە موکریدا بە دوو فۆرمو لــە بەرودواوە لەکاردایــە : ( ڤەکرن ، کرنەڤــە ، وەکە ، کردنەوە •

دیاردەی [ ەڤە ] و هەڵچەرخانەوەی بە [ ڤە ] یان وەرســـــووڕانی [ ەوە ] بە [ وە ] بەبێ سەبارەت نیە •

ئەم لایەنەش ئەوەندە ساکارنیە و لە شوێنی خۆیدا لێیدەکۆڵرێتەوە• لە بەراوردی نموونەکانەوە بۆ ئەم خشتەیەی خوارەوە :

## خشتەی ژمــارە « ٥ »

أ ـ وەك پێشگر لە سادەو لێكدراودا :

کرمانجیی سەروو + لقی بادینی + مــوکــری + ئەردەڵانی + بابانی

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| [ ڤــە ] | [ ڤە ] | [ وە/ەوە ] | [ ەو ] | [ ەوە ] |

ب ـ پاشگری دووبارە بەپێی ئەو هەرێمانە :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| [ •• ] | [ ەڤە ] | [ەوە/••وە] | [ ەوە ] | [ ەوە ] |

**تێبینی :**

لە زۆر جێگادا رواڵەتی « ڤە ، ەڤە » دێتە بەرچاو ، یان ئامرازو بەشە ئامرازە ، یان سەر بەگەردانو گۆڕانە دەنگە ، وەك :

١ ـ « تەگرت بەرمەدە ـ تەبەردا پەی مەکەڤە » •

کاری ( مەکەڤە ) دەقی گەردانی ( مەکەوە ) یەو ، پاشـــــگر نیەو بزوێنەکە شی راناوەو سەر بە کارە داخوازیەکەیە •

٢ ـ گەپ ژە فەکێ تە ڤەدەرکەت •

ئەمیش بەرانبەری ( وەدرکەوت )ی موکریو ( بەدەرکەوتی ) شارباژێریە • لە ئاخاوتنی گەرمیاندا قاڵبەکە پارێزراوە کە دەڵێن : ( کەفت وەدەر ) :

« وەختی کەفت وەخوار وەکۆڵ عەشتر
چگ بیاریدی کافر ••• زەجر »
« مەلا خدر مەندەلاوی »

مەبەستم ئەوەیە کە بێژەی ( ڤە = وە = بە ) لەگەڵ ئاوەڵکاردا ، ئامرازی پەیوەندی = پریپۆزیشنە •

٣ ـ « تو چ هورکی خوەرەگی خوە ئەوێڤە دەکەڤە کەفچێی تە » •
ڕواڵەتی [ ڤە ] لەدواوەی کارەکەوە بریتیە لە ( ڤ ) ی ڕەگیوشەکەو + [ ە ] ی ئامرازە پەیوەندیی ســـــــواوە •• کە لە لێکۆڵینەوەی لەمەوپێشو بەتەواوی چەندوچۆنی تێداکراوە •

★

## — ٢ —

**چەند دەقێکی کاری ڕابوردووی نزیك :**

١ ـ ڕابوردووی تێنەپەڕ :ـ

| | | |
|---|---|---|
| ئەز ڤستیمە | ئەم ڤستینە | بۆتان ←⫷ |
| تو ڤستییی | ئەو ڤستینە | |

| | | |
|---|---|---|
| ٢ ـ ئەز ڤستیم | ئەمێت ڤستین | بادینان ←⫷ |
| تویێ ڤستیی | هونێت ڤستین | |

| ٣ ـ بینراوی « ڕەبەق » | | نزیك | |
|---|---|---|---|
| ئەز چووم | ⟵ | ئەز چوومە | بەپێی هەندێ شوێن |
| ئەو چوو | ⟵ | ئەو چوویە | |
| ون چوون | ⟵ | ون چوونە | |

٤ ـ تێپەڕ :

| بینراوی | | نزیك |
|---|---|---|
| من ، مە گرت | ⟵ | من ، مە گرتییە |
| تە ، وە گرت | ⟵ | تە ، وە گرتییە |
| وی ، وان گرت | ⟵ | وی ، وان گرتییە |

نیشانەکە بە دوو فۆرم زەقبووەتەوە :

أ ـ بە دوای کاری تێنەپەڕدا کە کۆتایی بە بزوێن هاتبێ ، لەبرێ ئاخاوتندا ، تەنها بە روخساری « یە » دێتەکار ، وەك : ( ئەو چوویە ) . کە کۆتایی بە راناوی دەنگداربێ لە روخساری « ە » ی بزوێندایە ، وەك : ( ئەز چوومە ) .

ب ـ هەمان نیشانەو لە تێپەڕدا ، بە فۆرمی « یە » و بەگشتی ، خۆی دارشتوە .

ساکارانە بەسەریدا تێ ناپەڕین‌و ئەمجارەش تێڕوانینێك بە نموونەکاندا :

أ ـ « ئەز ڤستم ـ ئەز ڤستیمە » .

دەبێ بپرسین کە چ نهێنییەك لەوە دایە ، راناوی « م » کەوتوەتە نێوان « یـ » و « ە » وە ، هیچیشیان لە ڕەگی‌کارەکە نین ؟

بێ گومان هەر نیشانەی « یە » یە و راناوەکەی تێوخۆی گرتوە •
لەبۆتانیدا هەر بە ئەوکارتێکرانەیە کە لە شارباژێڕیو سەربە جافیو بڕێ ئاخاوتنی گەرمیانـدا ، بەدی دەکرێ ، بە نموونە : « من‌نووسـتم ، من نووسـتووم ـ یان نووسـتگم ، خەفتم ـ خەفتیمە » • لـە بێجگەی ( خەفتیمە ) دا ، بەشەبزوێنی « ە » تێچووە ، شێوە گەرمیانیەکەش لەگەڵ بۆتانیەکەدا جیاوازیی نیە : ( ڤسـتیمە ـ خەفتیمە ) ، زۆرتر دەڵێن ـ خەفتمە •

ب ـ « ئـەز ڤستیم » لـە بادینیدا هیچ جیـاوازیەکی نیـە لەگـەڵ ئاخاوتنی سلێمانیدا •• لەوەدا کە بەشی ـ یـ ، و ـ ی دەمێنێتـەوە ، وەك من نووستوم ـ بەم شی‌کردنەوەیە :

( ڤست ، نووست + یـ = یە + م • یان + و = وە + م ) •

بەلاٚم‌کـە لەبڕێ ئـاخاوتنـداو لەباری تایبـەتیـداو بـە « ە » خۆی دەردەخات‌و بەس ، نابێتە بەڵگەی دوو نیشانەی بنجیی ، تەنانەت لە شێوە زمانێکدا ، ئەمە ئەگەر لە تێنەپەڕیشدا وابێ ، وەك ( وەن چونە ) نابێتـە نموونەی سەرجەم ؛ چونکە لە تێپەڕدا بە « یە » خۆی ساغ‌کردوەتەوە ، وەك :

« ناڤێ گور دەرکەتیە ، لێ رووڤی مالا خەلقێ خراپ کریە »
« پەند »

**بازدانێکی سەیر !!**

نیشانەی « یە = وە » لەوپەڕی کوردستانی تورکیاوە ، ڕەوی‌کردوە بۆ مەڵبەندی گەرمیان‌و بەرەو پشـتکۆ •• هـەوار بە هـەوار بنەی تێدا خستوەو تەنها بەسەر هەرێمی بابانیو سەربە جافیو ئەردەلاٚنی ـ دا ، بازی داوەو لە نێوەڕاستدا ئارامی‌نەگرتوە •• !!

لەم دیاردەیەدا ، دوو بەڵگە بەدەست دەهێنین :

— یەکبوونی زمـــانی کوردی لـەمپـەڕاوپـەڕی زەمینەکـەیـدا ( کوردستانی گەورە ) •

— رەوکردنی ئێلاتی کوردانو نەسرەوتنیان لەدێر زەمانەوە •••!!

دەیلێمەوە : ئەگەر زۆرینەی وشـــەی کوردان بەتاوی دەرەکی ، هەرەس بهێنن ، تەنهـا ئەو سێ هـەلآلـەیـە ، پیرەداری زمـانـەکـەمـان دەبووژێننەوە •



## — ٣ —

**پاشکۆئامرازو چەند دەقێکی ئەم بنەیە :**

« خەون پێڤەدیتن ـ پێڤە : پێوە »

« خۆبدەستڤە بەردان »

« ل بنڤە = لە بنەوە »

« دەرڤا = دەرەوە »

« بفکر خوەڤا »

« ئەگەر هەڕی زاخۆ ، د مویسلڤە هەڕە »

« ڤێکرە هاتینە = پێکەوە هاتون »

« مەرتـالو رمێ ژ خـانـڕا بینن
چەکو ســـــیلحا ژ منڕا بینن »

« دمدم • کوردۆیێف »

ئەو پاشکۆیە لە شێوەی سەروودا بە چەند روخسارو فۆرم بەدی دەکرێ :

١ ـ بە « ڤە » یەکسانە چ بە دوای دەنگدارەوە بێ یان بەدوای بزوێنەوەبێ ، وەك :

( پێڤە ، بدەستڤە ) •

لە شێوەی تێوەڕاستدا ، بە « ەوە » بەدوای دەنگدارەوەو بە « وە » بە دوای بزوێنەوە •

ئەوانەی‌کە حەز لە سازدانی بەندی فۆتیمی دەکەن لێرەدا قسەکەیان هەڵدەوەشێتەوە ؛ چونکە لە ئاخاوتنی سەروودا بە زولاڵی دەڵێن : ( لبنڤە ، ل بنڤە ) هەروەك ئامرازی ( لە ) بە ( ل )ی گیر ، گۆدەکەن ، ناشبێتە بەڵگەی ئەوە کە بزوێنەکەیان زێدەبێ‌و بۆ لچ‌ئاسوودەیی سازدرابێ !!

کە لە ئاخاوتنی تێوەڕاستیشدا دەڵێن : لە بنەوە ، لەسەر بنجێتیی خۆی دامەزراوە ••• لەم دەربازگەوە بۆ ئەوە دادەکشێین کە بڵێین :

**« تێکڕای پاشگرەکەو پاشکۆ ئامرازەکە بریتیە لە ـ ەوە = ەڤە ـ »**

٢ ـ لە کۆنە ئاخاوتنی هەورامیشدا ، بەچەشنی شێوەی سەروو ، لە قاڵبی « ڤە » دا سۆراخم‌کرد ، وەك : « ••• داخوباڵاتەڤە •••• » •

٣ ـ لە هەندێ دەستە شێوەی سەروودا ، ( ڤا ) شوێنی ( ڤە ) دەگرێ و لەگەڵ ئاوەڵکاردا ، دەسازێ‌و بەبێ ئاڵقە پێشینەی ئامرازەکە ، وەك : ـ دەرڤا = دەرڤە ـ • هەمان رەتی هەیە لە شێوەی تێوەراستدا : ( سەرەوە ، بنەوە ، خوارەوە ) •

٤ ـ برێ جار به « ڕا » دەشکێتەوە ، لە هەندێ ئاخاوتنیشـــدا ، دەبێتەوە بە ( ڕە ) •

٥ ـ ئامرازی « بۆ ، ژ » لە ئاخاوتنی کوردەکانی ســــــۆڤێتدا ، پاشـــکۆی « ڕا » بەخۆیـەوە ڕادەکێشێ ، وەك : ( ژ منڕا = بۆ من ) •• لەم حەلەداو لە شێوەی تێوەڕاستدا ئەو ئامرازە ، بێپاشکۆیە •

ئەم لایەنە بەشوێنکەوتنێکی فراوانی دەوێ •• ئەوەنـدە هـەیـە ، پاشکۆی « وە » و شکانەوەی بە « ڕا ، را » دەورێکی بە تەوژمی هەیە ؛ بگرین لە یەریڤانەوە بۆ مەندەلیو زەهاو •

ئەمەش جێی سەرسوڕماننیە لە تاقە زمانی تاقە نەتەوەیەکدا • وەك : ( لە کووره ، •• کوێڕا •• کێڕا •• لـە بـەغــداڕا •• لـە ورا ، لـەوره بەهەڤڕا ••• هتد •

---

لەم قۆناغەداو هەوار بە هـەوار بەشوێن ئـەو سێ هەلاّلەیە کەوتم ، لە رووی هەڵکەوتو رووخسارەوە ، بەراوردم تێداکردن ••• زۆر لایەنی سەختو شاراوەو پەنامەکی ، بیرو ئەندێشــــەیان رەتانـدم بۆ دڵنیاییش چاوپێداخشاتێك بە ئەم خشتەیەی خوارەوەداو ئاوڕدانەوەیەك لە کورتـە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی لەمەوبەر و سەرەنجامی بۆچوونم لەم خشتەیەدا :

# خشتەی ژمارە «٦»

| جۆری شێوەی زمان | باشگری دووبارە | **نیشانەی** رابوردووی نزیك | پاشکۆ ئامراز |
|---|---|---|---|
| بابانی شارباژێری | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| موکری و سۆرانی | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| ئەردەلانی | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| گۆرانی « جافی » | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| هەورامی | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| لوڕی | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| فارسی کۆن و تازە | [illegible] | ە | : : |
| کرمانجی سەروو | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| لقی بادینی | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| ئەنجام | ە و ە | و ە | ە و ە |

— ١ —

نیشانەی [ وە ] لە چ کۆمەڵە کەرەسەیەکی زمانی کوردیە ؟ ..

ئەگەر پێشگرو پاشگر هەر ئەوەبن کە بە سەروبنی بێژەوە دەلکێن‌و بۆ هێنانەدی هەر جۆرە واتاو ئەرکێك ، لە وشە سازیدا ، ئەم نیشـانەیەو دەیانی‌دی ـ لە خوردە ، دەنگەکان ـ دەبێ بە پێشگرو پاشگر ناوبرێن .

نووسەران‌و زمانەوانان هەریەکەو بە تاوی شتێك ناوێکیان لێ‌ناوە ، وەك :

١ ـ عەلامەتی مازی نەقلی .

٢ ـ پیتی رابوردووی دوور .

٣ ـ ئامرازی رابوردووی گێڕاوەیی .

٤ ـ بزوێنی رابوردووی نزیك .

٥ ـ ئەداتی نەقلی .

٦ ـ حەرەکەی رابوردووی نزیك .

٧ ـ پاشگری ( وو .. ) بە دوو واو .

٨ ـ پاشگری ( و ) بە یەك واو .

---

لـەم بـارەیـەوە تووشـــی گـەرداوێـك بووین جـارێ لـەوزەی نیشتنەوەدا نیە !!

ئەمەی خوارەوە رای تایبەتیمە :

ــ ئەو کۆمەڵەی کە سەربە رستەسازیە وەك ئامرازی پەیوەندی = پریپۆزیشن ، بەستنەوە بانگ‌کردن ، ئیزافە ... هتد ، بـە ئاســـــانی جیادەکرێنەوە بەگشتی ناوی ( ئامراز ) یان بە باڵا دەبڕێ‌و گێچەڵاوی نین.

ــ ئەوانەشیان کە ســـــەربە دەنگ‌سازین ، بـە بەندی فونێمی‌و تێوبەست‌و تێوبڕو قورســـە دەنگ‌و لارەدەنگ و زێدە دەنگ‌و گنـەو منگەو ..... هتد ، هەڵدەهاوێژرێن .

ــ ماوەتەوە دژواری لە تێوان پێشگرو پاشگرو نیشانەدا کە هەر ســێکیان لـە وشـەسـازیدا دەوردەبینن‌و ئـەرك‌و خاســیەتیان لێکدی جیاوازن .. ؟!

بێتو ـ بابەتیانە خۆم لەم دەرەتانە بدەم ، لە تەوەری باســـــەکەم دەربازدەبم . ناچاریشم بە خواستی ئێرە تاراددەیەك بە شوێنی بکەوم :

١ ـ رام‌وایە کە پێشگرو پاشگر بەو چاوە سـەیربکرێن کە دەوری وشەسازی دەبینن‌و بۆ جیاکردنەوەی جۆری وشەن ، لە هەمان کاتیشـدا کاردەکەنە کرۆك گۆڕینی وشەکە لە مەبەستێکەوە بۆ مەبەســتێکی‌دی . وەك :

أ ـ وشـــەی « کرم » ، جۆرە نـاوە بۆ توخمە گیاندارێك ، بـە سەڵتی ، واتە بەبێ سەرنج‌دانی فەساڵ‌و کەم‌وزۆری لە ماکی خۆیدا ، ئنجا بە یارمەتی‌ی « ەك » وشــــەیەکی تایبەتی‌ی نوێ واتای لێ‌دادەبڕێ .. کە دەبێتە « کرمەك » : ناوە بۆ جۆرە خشڵێکی ژێرچەنەو پێك‌هاتوو لــە دانە زێڕی وەك ریزەکرم . لێرەدا کرۆك‌و رواڵــەت بە تەواوی گۆڕان ، کەواتە بێژەی « ەك » لە وشەی « کرمەك » دا ، پاشگرە .

ب ـ چاوگی « چوون » بزوتنەوەیەکی مەرکەزی‌ی دەگەیـەنێ لــە سوورگەی خۆیدا ، وەك دینەمۆیەك چەقی خۆی گرتوە ، بەهـۆی بێژەی « هەڵ » وەك دوگمەیەکی ئامێری ، بزوتنەوەکە بەرەو سەروو پیشان‌دەداو

له مەرکەزە رەبەقەکە دەی‌ترازێنێ ، یان بە هۆی « دا » بـەرەو خواروو ، خاسیەتەکە دەردەخا ... هتد .

بەلای‌منەوە ئەمانە لە ئەرکی پێشگرایەتیدا بەڵگەنەویستن .

ج ـ چاوگی [ شـــکانەوە ] کـە بـە هۆی [ ەوە ] لە [ شـــکان ] سازدراوە :

خاسێتی روودانەکە لـە ( بەردشکان ) دا جیاوازیی هـەیـە لەگەڵ ( شـــکان ) ی تووڵە دارێکدا ، بەشـــێنەیی ، کە بە ( شـــکانەوە ) دەردەبڕدرێ ، ئەرکەکە دیارەو ئەو مۆرفیمەش بە چەشـــنی ( هەڵ ، دا ) بەرەیەکی تایبەتی پێك‌دێنێ ، لە پاشگرو پێشگر .

۲ ـ جیاکردنەوەی ـ نیشانە ـ : بەتایبەتی ئەوانەیان کە ئەرکیان لـە ئاخاوتندا دیارەو ئەرکەکەشیان لە وشەدابڕیندا وەك پێشگرو پاشـگر بـە تەوژم‌نیە ؛ تەنها دۆخ‌و حاڵەتێکی تایبەتی پیشـاندەدەن ، کرۆك‌و واتـای وشەکە ئەو گۆڕانەی بەسەردا نایە .

بە نموونە :

أ ـ نیشانەی کۆ « ان » لە وشەی ( بەردان ) دا تەنها کۆی ( بەرد ) پیشان دەداو گەوهەری بەرد ، گۆڕاتێـکی کرۆکی ، بەسەردا نەهاتوە .

ب ـ نیشانەی « دە » کە بۆ گەردانی رانەبوردوو یـان رابوردووی بەردەوامی بێ ، وەك :

( خواردم ⟵ دەخۆم ، دەم‌خوارد ) کاری ( خـواردن ) لـــە هەمواندا هەر خۆیەتی ..

دەوری نیشـانەکە هەرئەوەیە کـــە راددەی زەمـــانی روودانەکـە دیاردی‌بکا .. بەرای من . ئەو کۆمەڵەیە لەوە پتریان بەدەمەوە نیە کە بە نیشانە ناو دێربکرێن .

بەپێی ئەو بەراوردە ، جێی خۆیەتی کە بە مۆرفیمی کاری رابوردووی نزیك بگوترێ نیشانە ، نەك پاشگر ... بۆچی ؟

که دەڵێین « هات » روودانی کاری هاتن ـ پیشاندەدا ، بەسەڵتی ، وەك بەبەرچاوەوەبێ .. بەڵام « هاتوە » لە گوزارەدا ، ئەوە دەردەخا ، کە هەمان کار بەر لە ئاخاوتن رووی‌داوەو نزیکە ، پتر لە باری خەبەردانەدا دەبێژرێ ، ئەم ئەرکەش سەربە دیاردی کردنێکی زەمانیەو گۆرینی گەوهەرو رەخسانی تایبەتی نیە .

بەداڵدەی ئەو لێکۆڵینەوەیە هەر لەسەرەتاوە بە پاشگر ناومنەهێنا .

لە مەیدانی هەڵاویشتنی کەرەسەی رێزماندا ، کارەکانمان سەرەتایی‌و بەیەکدا چوون‌و بەرنامانە هەنگاوێکی ئەوتۆ نەنراوە .

ئەو کارە رابوردوەی کە ئەم نیشانەیەی پێوەیە بەچی ناودێرە ؟ ..

أ ـ لە فارسیدا :

١ ـ ماضی قریب : رابوردووی نزیك بەرانبەر بە ـ **ماضی مطلق** : رابوردووی رەبەق .

٢ ـ ماضی نقلی : رابوردووی گێراوەیی .

ب ـ لە کوردیدا :

١ ـ رابوردووی نزیك ـ بەرانبەری رەبەق .

٢ ـ بگرتگ دوور ـ بەرانبەری دوورتر .

٣ ـ مازی نەقلی ـ بەرانبەری شهودی .

٤ ـ فرمانی رابوردووی تەواو ، ئیخباری .

٥ ـ کرنا دوربوری نەدیتی : الماضي البعيد غير الشهودي[١٠٧] •

ئەوانەو بگرە هیدیکەش بەکورتی : وامان بۆ رەخساوە کە هەر کەسەو بە لێدانەوەو زاراوەی خۆی ، قەڵەمی لێرابدا !!

دیارە ئەو خاوەن رایانەش ، سەرو بەڵگەیان هەیە ، جا لە تێڕوانینی زمانیدیکەوەبێ یانا • گرنگ ئەوەیە کە لەسەر لێدانەوەیەك یەکانگیرببینو زانستانەبێ •• !؟

خاسێتی رووداني ئەوکارە چۆن دیاریدەکرێ ؟ لەم رستەیەدا : ـ من خوێندم ـ بە رەبەقی بەکەسی دوەمی رادەگەیەنم ، کە بەر لە قسە کاری ـ خوێندن ـ م بەجێهێنا ؛ دەلوێ کە پێی بگوترێ ـ رابوردووی رەبەق • لەم رستەیەشدا : ـ من خوێندومە ـ رووداني هەمان کارە کە بەر لەقسە پەیدابووەو لە نزیکەوە رایدەگەیەنی وەك ئەوەی کە بە بەرچاوەوە بێو بەرجەستەبێ •

لە هەواڵدەریداو بەتایبەتی لە میانی پرسو وەڵامدا بەگورە[١٠٨] •

---

(١٠٧) بۆ ئەم سەرچاوانە :

١ ـ دەستور جامع زبان فارسي / ل ٤٤٧ •
٢ ـ القواعد الاساسية للدراسة الفارسية / د. الشواربي ل١٢٩ •
٣ ـ رێزمانی ئاخاوتنی کوردی / ل ١٧٧ •
٤ ـ فرهنگ مردۆخ / جلد اول ، ل١٥ •
٥ ـ مختصر صرفو نحوی کوردی / چاپی ١٩٢٨ •
٦ ـ رێزمانی پۆلی شەشەمی ئامادەیی / چ ١٩٧٦ ل١٥ •
٧ ـ آواو دەستورا زمانێ کوردی / چ ١٩٦١ ل١٣٩ •

(١٠٨) بۆ باری سەرنج :
گێرانەوە لە خاسێتی خاوبوونەوە ناپسێتەوە ، بە دووری نازانم کە هاودەنگیی نیشانەکە لەگەڵ پاشگری [ ەوە ] لە وەوە سەریهەڵدابێ ... بۆ باری دڵنیایی پێویستیمان بە لێکۆڵینەوە هەیە . لە هەمان دەربازگەی نەپسانەوەوە بۆ هاوروخساریی پاشکۆ ئامرازەکەش •

ئنجا نزيك يان گێڕاوەیی کامیان لەبارترە ؟

بێ‌گومان لە دیاردی‌کردنی پلەی زەمانـدا ، رەبەقمان هـەیـە • بـە رێژگەی تایبەتیشی پلەی دوورمان هەیـە دیـارە لەنێوان هەردووکیـانـدا پلەیەکی‌دی هەیە ، ژیرێژیانە بۆی بڕۆین پلەی نزیك تەســـــەوردەکرێ کەواتە : ( رابوردووی نزیك‌و نیشـــانەی رابوردووی نزیك بەجێن‌و چ پێویست بە تێچڕانی‌دی ناکا •

## — ٢ —

# ئەرکەکانی پاشگری [ ەوە ]

لە قۆناغی دوەمدا ســەرجەمی فۆرمە بەکارهاتوەکانیم دەورکردنەوەو لە خشتەی شەشەمدا ئەولایەنەم قفڵدا •

هەرچەندە لە نێوان ئەم نووسین‌و ئەو نووســـیندا! نێوبەنێو لایەنی ئەرکی پاشگرەکە سەری‌هەڵدا ، بەڵام بابەتیانە تێکەڵکێشی روخســـارم نەکرد ، ئێستاش وەك بەشە تەواوکەرێك لێی‌دەکۆڵمەوە •

## نماییشێك

أ ـ لیژنەی زمان ( بۆ رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ) : ئـەم ئەرکـانـەیـان داونەتەپاڵ :

١ ـ پێك‌هێنانی واتای تازە : ( کردنەوە : فتح ) •

٢ ـ جوداوازی مەفهومی کۆن‌و تازە : ( خواردن ـ خواردنەوە ) •

٣ ـ هێنانەدی واتای بنجی : ( پاڕانەوە •• ) •

٤ ـ دووبارەکردنەوە : ( هاتن ـ هاتنەوە ) •

٥ ـ راگەیاندنی دوو واتای سەربەخۆ :

( چوونەوە = رۆیشتنەوە ـ چوونەوەی رەنگ ) •

ب ـ دە ئەورەحمانی حاجی مارف ، بەسەرناوی ـ واتا سەرەکیەکانی / ەوە ـ وە / هەر ئەو ئەرکانەی دیاردیکردون • ( بۆ کتێبی وشە رۆنان لە زمانی کوردیدا ) •

جـ ـ دە نەسرین فەخری ( بۆ گۆڤاری کۆڕ ، ژ ، ب ـ ١ ـ ) دەڵێ واتا = مەعنی سەرەکیەکانی [ وە ] ••• بەر لەوان ، ئەم یازدە واتای داوەتەپاڵ ، وەك :

١ ـ گۆڕینی مەفهوم : ( سووتان ـ سووتانەوە ) •

٢ ـ گۆڕین لە حاڵەتەوە : ( ساڵ گەڕایەوە ) •

٣ ـ گۆڕینی مەعنای وشە : ( خوێندن ـ خوێندنەوە ) •

٤ ـ دروستبوونی دوو واتا : ( چنین ـ چنینەوە ) •

٥ ـ گۆڕینی واتا : ( گرتنەوە ) •

٦ ـ دووبارە : ( گرتنەوە ) •

٧ ـ پێكهاتنی دوو مەبەست : ( ڤەخواردن ) لە کرمانجیی سەرووودا متوربەبکرێ بە ( خواردنەوە ) ی کرمانجیی خواروو ، بگوترێ : ( ڤەخواردنەوە ) •

٨ ـ واتای هاومەبەست : ( فلیقان ـ فلیقانەوە ) •

٩ ـ دروستکردنی پێشگری نوێ : ( تێوە چوون ) •

١٠ـ چاوگی بێواتا ـ مردوو ـ دەکا بە واتادار :

( پلیشان ، فلیقان ، بووژان ـ فلیقانەوە ، بووژانەوە ) ••••

د ـ هەروەها ـ دە مەکەنزی و کوردۆییف وەك ئەوان دەڵێن : بۆ گۆڕینی مەفهوم ••••

هـ ـ مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ( بۆگۆڤاری کۆڕ بەرگی یەکەم ) دەڵێ بۆ سێ مەبەستە ( ١ ـ دووبارە ، ٢ ـ گەڕانەوە ، ٣ ـ بەرەبەرە ) ئەویش دەڵێ چاوگی بێواتای پێدەکەویتە گەدان ، وەك ( بووژانەوە ، پاڕانەوە ) •

بۆ چوونی مامۆستا خاڵ ، هەر ئەو وردبینیەیە کە لە پێشەکیی فەرهەنگەکەیدا ( جزمی یەکەم ) هێمای بۆ کردوە ، تارادەیەك لە ئەرکی سێیەمیدا جارێ هەر ئەوەندە دەڵێم :

زاوزێی ئەو ئەرکانەی کە لەم نمایشەدا خرانە بەرچاو ، خوای‌دەکرد پێنج‌و شەش‌و یازدە نەدەبوون‌و بیست دەبوون لە گەوهەری ئەم سێ ئەرکەی خاڵ دەربازنین‌و کاریش بە ئەوەندەوە ناوەستێ‌و پێداچوونەوەی دەوێ ، بەچاو هەموانەوە •



* ئەم پاشگرە لە خۆیدا ، خاوەن ئەرکە یان خاوەن واتا = معنی ـ یە ؟

زوربەیان واتایان‌دایەپاڵ‌و بەلای منەوە راست‌نیە ؛ ئەو مۆرفیمە بە سەڵتی ، هیچ(١٠٩) مانایەك ناگەیەنێ •• بگرە لەکاتێکدا بیچم = هیأة ـ یێك بەلکانەوە پێك‌دەهێنێ ، دەبێتە هۆی پەیدابوونی گۆڕانکارییەك ،

(١٠٩) ئەگەر بیانوویان ئەوەبێ کە لە عەرەبیشدا ـ بەنموونە ـ دەگوترێ : ( حروف المعاني : مثل ـ من ، الى ، عن ... الخ ) .

ئەوان لەسەردەمێکدا ئەمەیان سازداوە کە زاراوەی ( حرف ) یان بە هاوبەش بۆ ئەلفوبێ‌و أدوات‌و علامات ، بەکارهێناوەو تازە خۆیان پێ‌راهێناوە . سەردەمی زانست‌و رێگای بنیادنانمان ، ماوەی ئەو چاولێکەریەمان نادەن ، بۆیە هەر لە سەرباسەکەی خۆمدا ، نووسیم: ئەرکەکانی پاشگری [ ەوە ] : ... هتد .

ئەویش سەرەنجامێکە لەتێکڕای گەردانو لکانەکەوە پەیدادەبێ ..
دەنا [ ەوە ] بەروتی هیچ واتایەك نابەخشێ .

به نسوونه : له تێکڕای ( هات + ەوە ) دا باری تازەگی ، مەبەستێك دەگەیەنێ که به سەڵتی له ( هات ) دا و به تەنێ له [ ەوە ] دا بەدی ناکرێ لەگەڵ ئەوەشدا واتای ( هاتن ) هەوێنو شیرازەی هەردووکارەکەیە .

بە سەرنجدانی رای زمانەوانەکان ( بۆ قۆناغی یەکەم ) و ئەم کورتەنمایشەی ئێرە ، کەمتابێژێك پەنجەیان بۆ ئەرکەکانی راکێشاوە ، بەپێی بەراورد ئەوەیان داوە بە دەستەوە کە لەسەر یەك یان دوو ئەرکی سەرەکی یەکانگیرن ، وەك : ( دووبارەو گەڕانەوە ) .. زاوزێی ئەرکەکانی دیکەش زادەی بۆنەچوون یان لادانە ، لەبارێکی هەرەناسکی جاویدانی یەکێ لە ئەرکە بنجیەکانی ئەم پاشگرە(١١٠) .

مەسەلەی زمان وەك پارچە زێبایەکی بەیەکەوە چنراوە ، لە کوێدا قوڵفەیەکی ترازا پارچەکە هەڵدەوەشێتەوە ، هەرچۆنێ گرێش بدرێتەوە ، سفتیی ئەو تەونە بە خاڵێکی ناقۆڵا ، دزێودەبێ لە نەپێکانی رووداني شێنەییدا ، چەندان ئەرکی دووبارە بوو = تحصيل حاصل ـ و بەیەکداچوو، تێچڕاون ، کە دەڵێن :

١ ـ « بۆ گۆڕینی مەفهومی وشە ، وەك : ـ خواردن ـ خواردنەوە » .

---

(١١٠) تارادەیەك ، تەنها مامۆستا خاڵ وردبینی لەو ئەرکە سەرەکیەدا کردوە ، کە پێی دەڵێ : « رووداني بەرەبەرەو تدرّج » . چەند نموونەیەکی بەپێی ئاخاوتنی سلێمانی تەفسیرکردوە ، ئەو بەگشتیەکەوە ئاوڕی لێداوەتەوەو بەراوردی تێدانەکردوە و لە هەندێ شیکردنەوەیدا رای ئەویش پەسندناکەم .

ئەم جیاکاریە بەراست نازانم ؛ هەر وشەیەك ئەو پاشگرەی پێوەبلکێ شتێکی ئاسـاییە کە مەبەسـت دەگۆڕێ ، جا بۆ دووبارەبێ یان بۆ گەڕانەوەبێ ... یان بۆ هەر مەبەستێکیدی .. بۆمان هەیە سـەرجەمی ئەرکـەکـان بەگۆڕینی مەفهوم لێبدەینـەوە !! ئەگەر ئـەو گۆڕانکاریـە پەیدانەبێ ، دەبێ لێکەمکردنو لێزیادکردنی وشـە چ بایەخێکی هەبێ ، بار لێگۆڕین دیاردەیەکەو لەگشـت کارتێکراتێکدا بەدیدەکرێ .. دیسان ئەو نموونانەی کـە لـە جغزی « گۆڕینی مەفهوم )دا بەندکراون ، گشتیان بۆ کاری شێنەیین ، دابڕانی کارێك لە کوتوپڕیەوە بۆ خاوبوونەوە لەخۆیدا گۆڕاتێکە .

٢ ـ « گۆڕینی مەعنـای وشـە ، وەك : چوون ـ چوونـەوە / بۆ ڕەنگ ، خوێندن ـ خوێندنەوە » .

أ ـ لەگەڵ نموونەکانی پێشودا ، هیچ جیـاوازیـانـنیەو ئەرکێکی سەربەخۆنیە .

ب ـ مانایەکی تازەگی وایان بۆ پـەیـدا نەبووە کە پەیوەندیی بـە کۆنەواتاکەیەوە نەبێ ، بە وێنە « چوون » بەجێهێشتنو دەربازبوون لـە تێوەندێکەوە دەگەیەنێ ، لە « چوون ، چوونەوەی کاروان ، یان ڕەنگ ، بەفر ..»دا ، هەموویان لە گەوهەری کارەکەدا هاوبەشن .. ئەوەندە هەیە کاری ( ڕەنگچوونەوە ، بەفر چوونەوە ) خاوکارانەیەو بە یەك تەکانـنیەو خاسێتی کارەکە هەر هەمان خاسێتە ، لە باری ڕوودانـدا .

٣ ـ « گۆڕین لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێك ، دیسـان وەك چوون ، چوونەوە .. ساڵ گەڕایەوە » .

لێرەشدا ئەرکی سێیەمو دوەمو چوارەم ( بۆ نمایشـەکە ) بەیەکدا چەواشە بوون ، تەنها « چوونەوە » بووەتە نموونەی گۆڕینی حاڵەت ...

گۆڕینی واتا • هەروەها « گەڕانەوە » بۆ گۆڕینی حاڵەتو ، گەڕانەوە بۆ دواوە ، ئەوەش ڕاستنیە ؛ ئەگەر چوونەوە بۆ مەبەستی ڕۆیشتنەوە ـ بێ ، بۆ دووبارەیە ، چوونەوەی ڕەنگیش بۆ لادانی شـێنەییە • سـاڵ گەڕایەوە ـ ش بۆ ( عودة ) •

هەروەها زوربەی نموونەکان لە چەند واتاو فەرەزیاتێکدا ، دووبارەو سێبارە بوونەوە !! کە هەمووشیان سەربە یەك خاڵی فەرامۆشکراون •

٤ ـ « پێكهاتنی دوومەبەست وەك : ـ ڤەخوارن ، ڤەخارن ـ لـە کرمانجیی سەروودا بە پێشـگرەوە بۆ واتای ( خواردنەوە ) هەمان کار پاشـگری [ وە ] ی پێوەبنێینو بنووسـین « ڤـەخـواردنەوە » لـەبـاتی ئـەوەیکـە بڵێین ـ دووبـارە خواردنەوە ـ » •

تاقە مۆرفێمێكو لەیەك کاتداو بەیەك وشـەوە چەند ئەرکێکی پێبسپێردرێ زیربێژیانە نیە ؛ کورد گوتویەو دەڵێ : ئاوم خواردەوە یـان ڤەخارد ، لەم حەلەدا تەنها بۆ کاری شێنەییە هیچ ئەرکێکیدی نابینێ • بۆ دووبارە ڕوودان بێژەی تایبەتی بەکاردەهێنێ وەك ـ دیسـان ، یەك جار ، دووجار خواردمەوە ••• هتد •

ئەو جۆرە ڕێژکانە خۆکردو کورد واتەنینینو تەنها دەسـتکردنو سەربە هیچ دیالێکتێك نینو وشەش دروستناکرێ •

**٥ ـ « هێنانەدی واتای بنجی یان واتای هاومەبەسـت ، وەك :**
ـ پاڕانەوە ، فلیقان ، فلیقانەوە ••• چونکە فلیقان واتای نیە ، چاوگی مردوە ••• » •

جارێ ئەوەندە دەڵێم :

أ ـ ئەگەر « فلیقان ، پلیشان » بێ واتابن چۆن دەبنە هاومەبەستی « فلیقانەوە » ؟ ••

ب ـ كه مردووبێ ، چۆن زیندوو دەبێته هاومەبەستی ؟!

بە زولاڵی دەگوترێ : ( ترێیەكە فلیقا ، فلیقاوە ، تەماتان مەفلیقێنە ، دەستم بتگاتێ دەت فلیقێنم • لاریش لەم گەردانەدا نیە :ـ

( فلیقا ، دەفلیقێ ، بیفلیقێنە ، فلیقاوە ، فلیقاندی ، فلیقاندیەوە ) !!

٦ ـ « دروستكردنی پێشگری نوێ ، وەك : لە پێوەبوون ، تێوەچوون ـ دا ••• هتد •

ئەم واتایە ( بە حیسابی نمایشەكە ) ، لادانێكی زەقەو پەیوەندیی بە پاشگرەكەوە نیەو پاشكۆی پریپۆزیشنەو سەربە رستە سازیە ، وەك بەم گەردانەی خوارەوە روونیدەكەمەوە :

« پێیانەوە ••• پێتانەوە چووم ••• پێیەوە ••• پێتەوە هاتم ••• هتد »(١١١) •

بۆ گەڕانەوەو دووبارەش دەگوترێ : ( پێوەبوونەوە •• پێیانەوەچوومەوە ••• ) •

## روونكردنەوەیەك

* بەرلەوەیكە دابخزێمە لێكۆڵینەوەی بابەتەكەوە ، ئەو زمانەوانانەی لەم باسەیان داوە كۆمەڵە كارێكیان دەستنیشانكردون كە بێواتانو بەبێ ئەو پاشگرە بەكارناهێنرێن ، وەك ( بریسكانەوە بووژانەوە، پاڕانەوە لالانەوە ، فلیقانەوە ••• ) ئەمانەو دەیانیدی گوایە چاوگی كوێرەوەبوون •

---

* (١١١) لەمێژە هەست بەگلەییەكی شاراوە دەكەم : بۆچی ئەم بەحسەم بە سێلانە چڕكردو تووشی پسانەوە بوو ؟!

راستە كە پاشكۆ ئامرازێكو نیشانەیەكو پاشگرێكم بەیەكەوە لە روخساری [ ەوە / وە ] دا جەڵەكردن . بەسەرنجدانی ئەو جۆرە چەواشەبوونانە زمان دۆستان ، لێم دەسەلمێنن .

کەسێك دەتوانێ ئەو بڕیارەبدا ، کە ئەو جۆرە چاوگانە لەسەرتاپای دیالێکتو بەشــە دیالێکتەکاندا تاوتوبکا •• یان بەچی بزانین وێنەی ( لالآن ، پاڕان بووژان ••• هتـد ) لە خۆیـانـدا چاوگ‌بوون •• یان ساختەن ؟! زۆر وشە ( بەتایبەتی کارو داتاشراوەکانی ) لە شێوە یان بەشە شێوەیەکدا بەگوڕنو کەچی لە چەند لقێکی‌کەدا ، سستن‌و بەبێ پاشگرەکە ناجوولێن . هەرچەندە لەمیانی لێکۆڵینەوەکەمداو لەمەوپێش نیگام‌داوەتێ، لێرەدا چەند نموونەیەك زەق‌دەکـەمـەوە ، تەنهـا بۆ ئەوەی‌کـە لەو جۆرە حوکمەدا پەلەی‌تێدانەکەین :

١ ـ ئاوخۆن = ئاو دەخۆنەوە :

« ئاوخۆن وە دەس حوسـەین نازار
قەومێل ئومەییە بوون وە پەشیمان »
« مەندەلاوی »

٢ ـ متاوا = دەتوایەوە :

« دڵ ئەر جە سـەنگ‌بی متاوا ••• »
« خانا »

٣ ـ گەشا = گەشایەوە :

« رۆژ گەشـا لەنێو سـەمای بێ‌گەردا
کێـوی کـۆڵـنـج ئـارەقـەی دەردا
« ئاگریی فەیزوڵلا بەگی »

لە ئاخاوتنی سلێمانیدا : ( گەشا ، دەگەشێ ) گەردان‌ناکا ، پاشگرەکە شێنەییانە دەی‌جوولێنێ :

« گەرمی‌و تەڕی بەهـاره کـە پشـکۆ کوژایەوە
پشـکۆی گوڵاتەشین بـە نەسیم‌بوو گەشایەوە »

« نالی »

٤ ـ یان لە هەندێ ناوچەدا « تلان » بە « اندن » گەردان‌دەکاو لـە هەریسێکی‌دیدا ، دەبێ پاشـــــگرەکەشی لەتەکدابێ ، دەنـا ، ناکـــەوێتە گەردان :

« هەزاران گابـەرد ســــێڵاو تلاندی
هـەزاران پیرەدار تۆفان شکاندی »

« ئاگری »

وشەی « تل » لە ئاخاوتنی سـلێمانیدا بە کاری یاریدەدەر یـان بـە پاشگرەکەوە گەردان دەکا :

أ ـ « بـە دەردی خۆیـەوە دەتلێتـەوە »

« نەستەق »

ب ـ تلی‌دا ، تلی‌پێ‌دا ، تلی‌پی‌داوەتەوە ...

« ناورێگا تـەق‌تـەق لاڕێ بەردی زل
کـە هێشـتا گەردوون پێی‌نەداوە تل »

« گۆران »

٥ ـ لـــە کرمـــانجی‌ی نێوەڕاســـــتدا ، چاوگی ( خولان ) بەبێ پاشگرەکە ، گەردان‌ناکا ، کەچی لە قاڵبێکی‌دیکەداو لە زمانی کوردەکـانی سۆڤیت ـ باکۆ ـ دا ، بەبێ پاشگرەکەش بەگوڕە ، وەك :

« ئـاش دەشخولێ لـسەر ئاقێ
لاو دەگری شـــخولێ باقێ »
« گەپێ پیشینان »

پێویست بە نسوونەی زەبەندناکا ، ئەمانەش رۆژنەیەکن بۆ یەك‌بینەی لێکۆڵنەوەکەم .



* بەتاوی لێکۆڵینەوە بەرەو رووی چەند پرسیارێك دەبینەوە :

١ ـ ئەو خێلە وشەیەی‌کـە بەبێ پاشگرەکە ناجوولێن‌و مەبەســـــت راناگەیەنن ، دەبێ لەبەر چی‌بێ ؟ ..

٢ ـ ئایا تا چ رادەیەك ئەو پاشگرە بەگوڕە ؟ ...

٣ ـ دەتوانین ـ بێجگە لەو سێ‌ئەرکە ، هی دیکەی بۆ دەست‌نیشـــان بکەین ؟ ...

٤ ـ ئەو وشە سستانەی‌کە بەگشتی خراونەتە بەرچاو ، ئایا لـە سەرتاپای کرمانجی‌ی نێوەراستدا ، هەروەها مردەن ؟ .

پرسیارکردن زۆر ئاســـانە ، بەڵام وەڵام لەلانەی ســـەخت‌دایەو سرکە .

تا ئێستا ئەو پاشگرە لێکۆڵینەوەیەکی خەستی بەخۆیەوە نەدیوە .. ئەوەی‌کە لە وزەی منیش‌دابێ سەرەتاتکەیەکە لە پشـــکنین‌و بەراورددا ، لەوێوە trووسکایی بەدی‌دەکەم‌و هەنگاوی بۆ دەنێم .

دوای شی‌کردنەوەوبەراوردکردن بۆم دەرکەوت ئەو کۆمەڵــە ئەرك‌و نسوونەزەبەندانە لە ئەنجامی بڕواپێنەبوون یان یەکالانەکردنەوەی ئەرکێکی

سەرەکیەوەیە ، ئەویش مەبەستی « روودانی شێنەییە » ، ئەمیش تا ئێستا لە قاڵبێکی کامڵدا نەمەیوە ، بەلای منەوە ، لەبەر چەند هۆیەکە :

١ ـ هەژاریمان لە پەیڕەوی بەرەنجامیدا •

٢ ـ تەشخیس نەکردنی تایبەتی وشەو دابەزینی لە واتای بەراییەوە بۆ واتای نوێباو = مصطلح •

٣ ـ لا نەکردنەوە لە دوو زانستە زمانیی سەرەکی : « وشەگەردانیو رەوانبێژی » •

٤ ـ لا نەکردنەوە لە خاڵێکی سەرەکی ، کە گوڕپێدانو « شحن »ی وشەی ناپەیدایە ، لە کارگەردانیدا(١١٢) •

**سـوراخێك :**

لە ئەنجامی پشکنیندا چاوگێکم هاتەوەیاد ، کە بەرووتی واتایەکی هەیەو ، کەچی لەگەڵ پاشگری [ ەوە ] دا واتایەکی دژ پەیدادەکا دوای ئەوەش کە پشتم بە بیرەوەریی خۆم نەبەست لە گەشتێکمداو لە ساڵانی ١٩٧١ ، ١٩٧٢ ـ دا ، بۆ مەبەستی کۆکردنەوەی کەلەپوور ، تەواوەتی زەینمدایە ئەو چاوگە ، ناڕاستەوخۆ لە چەند شـوانێکم تابینادەکردەوە ، ئەویش گەردانو بەکارهێنانی چاوگی « بووژان » ە •

پێچەوانەکەشی کە « بووژانەوە » یە ئەوەندە ئاسکە ، لە زمانی ئەدەبیدا پەلی هاویشتوە • لەوەش بەئاگاین کە حیسابی مردەو بێواتایان بۆ « بووژان » کردوە ئیسپاتیشی دەکەم کە چاوگێکی بە گوڕە بەلام

(١١٢) بۆ مەبەستی گوڕپێدانو هێزپێداهینانەوەی کارو چاوگ بەتاوی پاشگری [ ەوە ـ و ـ اندن ] زاراوەی ( شحن )ی عەرەبیم بەکارهێنا ، چونکە ئەو مەبەستەیکە گەرەکمە بە بێجگەی ئەو زاراوەیە بۆم دەرنابردرێ .

پەیوەندیی لە نێوان ( بووژان ـ بووژانەوە ) ٠٠ دا چیــە ؟ ٠٠ یان تا چ رادەیەکە ؟

سەیر لەوەدایە کە ئەو چاوگە بە رووتی بۆ واتای ( چرووســـان ) و ( نابوودبوون ) بەکاردەهێنرێ[١١٣] شانبەشانی ئەویش « بووژانەوە » بۆ واتای ( بەخۆداهاتن و ژیانەوە ) ئاشکراو باوە ٠

ئەم وشەیە لە بەراییدا سەربە ئاژەڵەو بە خوازە ـ وەك ســـــەدان وشەی دی ـ بۆ مەردومیش لەکاردایە ؛ کە دەگوترێ :

« کارژیلەکە ٠٠٠ یان گوێرەکە ساوایەکە ، بووژاوە = چرووساوە٠٠ لە گەشەکەوتوە ٠ منداڵەکە بووژاوە = شیرەمردەیەو هەڵناپشـــکوێ ٠٠ هتد » ئەمەش گەردانەکەیەتی :

( بووژا ، دەبووژێ ، بووژاوە ، بووژاندی ٠٠ ) ٠

هەر لە هەمان ناوچەدا « بووژانەوە » بــە واتای ( گوڕپێداهاتنەوە ) بەگوڕە ، وەك سەرمابردەیەکی کەسیرە ، کە خۆی بــە ئاگردا رادەدێرێو دەڵێ :

( ئۆخەیش بووژامەوە ) یان ئاژەڵە لاتێك بۆ ماوەیەك دەکرێتە رەوەو شەوق هەڵدەهێنێ ، دەربارەی دەبێژرێ :

( گاپیر بۆخۆی بووژاوە + ت + ەوە ! )

ئێستاش بووەتە زاراوەیەکی چالاك لە هەرە شوێنی ناسکدا ٠

---

(١١٣) بۆ دڵنیایی :

ناوچەی ماوەت ـ دێی مێوەلاکــە ، ١٩٧١/٨/٢٩ : لــە میــانی چاکوچۆنیدا ، ئافرەتێکی سەرەو ناسیاو ئەم پەندەی بەدەمدا هات : « دەڵێی گیسکەکەی هەیاسی خاسم ، هەر دەخۆمو ـ دەبووژێم ـ » ناراستەوخۆ راڤەی کرد : ( خواردنم هەیەو شکۆفەی پێناکەم ، هەر لاوازدەبم !! ) ٠

رەچەڵەکی واتای ( بووژان ) لە گورِ وەستانە •• نەكمردن و نەمان • واتای ( بووژانەوە ) ش ، گورِپێدا هاتنـــەوەیـە ، نـەك زیندوبوونەوەی پاش مردن ••••

شت دوای چرووسانو نابوودی هێزێکی هەستانەوەی تێدا دەمێنێو بەرەبەرە ـ دەبووژێتەوە ـ پەیوەندیی نێوان [ بووژان ـ بووژانـەوە ] دژواتاییە •• ئەمەش لایەنێکی باوە لە زانستی بەیاندا •

لەوانەیە بە سۆراخو بەرەنجامی ، نموونەی دیکەش بدۆزرێتـەوە • بەهەرحاڵ لە ئەو لێکۆڵینەوەوە ئەرکێکیدی پاشگری [ ەوە ] م بەدیکرد، کە تا ئێستا پەنجەی بۆ رانەکێشراوەو فیلۆلۆژیانە بۆی نەچوون •

دیسان نموونەیەکیدی زەقدەبێتەوە کـــە دیاردینەکراوە ، کـورد دەڵێ : [ کردن ـ کردەوە ] • دەبێ بپرسین ئەرکی پاشگرەکە لێرەدا چیە ؟ لایەنە روخساریەکە ئەوە دەدا بەدەستەوە : قەدی چاوگی ( کردن ) دەبێتە ( کرد ) بە زێـدەی [ + ەوە ] دەبێتـە « کردەوە » وەك : فلان کردەوەی باشە ••• کردەوەی نالەبارە •• هتد • بە دووری نازانم کە « کردەوا » بووبێ بە هاوکێشەی « دەستەوا » •

کەواتە ئەرکەکەی ئەوەیە کە قەدی چاوگی ریشـــــەیی دەکـاتـە چاوگەناو = ( مصدر اسمي یان اسم مصدر ) ، ئەم ئەرکەش لـە رووی گەردانەوە لێی نەکۆڵدراوەتەوە •

کورتە ئەنجامێك :

١ ـ تا ئێستا بێجگە لـە ئەرکی ( دووبارە ، گـەرِانـەوە ، شـێنەیی ) نوسەرانو زماندۆستان چیدیکەیان لێزیادنەکردوەو زۆرینەشـیان ئەرکی سـێیەمیان شـێوانـدوە ، وەك لــە نمایشـــەکەدا ، خرایە بەرچاو •

٢ ـ بەش بەخۆم دوو ئەرکیکەم خستەپال • تەکانیش دەدەم کە ئەرکە سێیەمەکە بیووژێنمەوە •

**سەودایەك لە نێوان پاشگری [ ەوە ] و پاشگری [ اندن ] دا :**

دوای پشکنین ئەوەم بۆ زەق بوەوە کە هێلانەی پاشگری [ ەوە ] ، دواوەی وشەیە •• با لە هەرێمێکی زەمینەکەشیدا وەك پێشگر بەکاربهێنرێ ؛ هەرچۆنێ بەکاربهێنرێ بەرەو بەشی پەیدایی خۆی هەڵدەخزێنێ ، وەك لە چاوگ‌و کاردا جوولآن ، نمایانە • دیسان ئاوەڵناویش دەستبەرداری لایەنە پەیدایەکە نابێ ، وەك : ( سوورکەرەوە ، پانکەرەوە ••• ) کە بەتاوی پاشگرەکە کاریگەرن •

لە رووی تەوژم‌و لکانەوە وشەکان دەکرێن بە چەند خێڵێك :

١ ـ ئەو جۆرەیانکە لە راگەیاندنی پەیدابیدا چوستن‌و بە یەك تەکان ، بەرپادەبن ؛ لە خۆیاندا هیچ پێویستیان بە خاوبوونەوەنیەو بۆ دوو مەبەست پاشگرەکە وەردەگرن :

أ ـ بۆ دووبارەبوونەوە ؛ وەك : ( دانیشتن ـ دانیشتنەوە ، فڕاندن ـ فڕاندنەوە ) •

ب ـ گەڕانەوە بۆ دواوە : ( هاتنەوە ، چوونەوە )[١١٤] •

٢ ـ ئەو جۆرە چاوگانەیکە هێدی‌هێدی روودەدەن • پاشگری [ ەوە ] دەورێکی سەرەکی دەبینێ لە زەق‌کردنەوەو تەمسیلی رووداوەکەدا بەشێوەیەکی وێنەگەریانە لەوەبەولاوە ئەرکی‌نیە •

بەراوردی دوو نموونە :

---

(١١٤) وشەی گەڕانەوە ـ ش لە ـ هاتنەوە ، چوونەوە ـ بەدەرنیە . مامۆستا خاڵ : ( بۆ هەمان سەرچاوەی پێشو ) لەو دووکارە زیاتری نەدۆزراونەتەوە .

أ ـ بردنی شتێك = فڕاندن ، بردنی شتێک بۆ ئێو شـــــتێك ، خاسێتی ئـەو کـارە بـە خاوبوونـەوەوە نیـە ، کـە دەڵێین : ( شـــتەکەمـان بردەوە بۆ ماڵێ ) لە دەربازگەی گەڕانـەوەو دووبارەدایە •

ب ـ بردنەوەی گرەو : ڕووداتێکی شـــێنەییە ، بەبێ ئـاوەڵکـار مەبەســـتی دووبارە ناگەیەنێ ، وەك : ( دووبارە گرەوەکەم بردەوە ) •

ڕوودان بە شێنەیی باشتر دەردەکەوێ تاوەکو جوولانی ســــەر لە ناکاو •

لە ڕەچەڵەکدا هەردوو کردەوەکان لە کاری ( بردن ) دا هاوبەشـــن و جیاوازییەکی ئەو تۆیان نیە کە ببێتە پەیداکەری ئەرکێکی سەربەخۆ بەناوی ( ••• گۆڕینی واتا ) •

٣ ـ خێڵە وشـــــەو کارێکن کە پەیدابیان تێدا سستە یان ڕوودانیان تێدانیە ، لەبەر چەند هۆیەك :

أ ـ دابەزینی وشە بەراییەکە لە جامیدەوە ••

ب ـ لە وشەی دەنگ و ئاوازەوە ••

جـ ـ لە تەمسیل و روخسارەوە ••

د ـ بەهـۆی دەنگ گۆڕان و گەردانی تایبەتیـەوە لە بنکەی خـۆی دوورکەوتبێتەوە •

هـ ـ هۆگربوونی لە شێوەیەکداو چروسانی لە شێوەیەکی دیکەدا • ئەو بابەتە وشانە بەدوو پاشگر شەحن دەبن و دەجوولێن :

أ ـ لە پلەی یەکەمدا بە ( اندن ) و تەنها ئەرکی ئەم زێدەیە ئەوەیەکە دەیکـاتـە خـاوەن پـەیـدایی و گـەردان دەکـا ، وەك : ( پۆل ، پیت =

بەرەکەت / بارِە ، هارِە ، ئۆکسید ، لوورە ، گرمە ، ••• هتد ) •

دەبن بە ( پۆلاندن ، پیتاندن ، بارِاندن ، هارِاندن ، ئۆکساندن ، لووراندن ، گرماندن ••• ) •

بە نموونە : دەنگە ناوی « گرمە » هیچ بزووتنەوە کارێکی تێدانیە • بەڵام دوای شەحن‌بوونی بە ( اندن ) واتای کاری بۆ پەیدادەبێ ، لێرەدا نهێنییەکی زمان سەرهەڵدەدا کە تا ئێستا زوربەی زمانەوانان ، تێیدا ، گیریان خواردوە ؛ چونکە وای‌بۆچوون : هەر وشەیەك ( اندن )ی پێوەلکا ، ئەوا دەبێتە کاری تێپەرِ ، بە بەرچاویشەوەیە کە وێنەی گرماندن‌و لووراندن تێنەپەرِ = لازم ـ ن لەلایەکی‌دیکەشەوە لەگەڵ راناوی تێپەرِدا ، گەردان‌دەکەن ، وەك ( قرِە ⟵ قرِاندی ، دەقرِێنی ، بقرِێنە ، قرِاندمان ، قرِاندم ، قرِاندیان ) بەچەشنی ( کوشتم ، کوشتمان ، کوشتی ، کوشتیان ) ، دەبوو کاری ( قرِاندن ) وەك ( نووستم ، نوستین ، نووست ، نووستن ) گەردانی بکردایەو راناوی تێنەپەرِی وەربگرتایە ؟!

دوای بەراوردو لێکۆڵینەوە ، ئەم گرێ‌کوێرەیەم بۆ خاوبوەوە :

أ ـ تەوژمی « اندن » هەر ئەوەندەیە کە یەك ئەرك ببینی لەگەڵ پێوەلکاوەکەدا ، ئەمەش یاسایەکی گشتیە لە بەکارهێنانی هەموو مۆرفێمێکدا ، واتە لەیەك کاتداو لەگەڵ تاقە وشەیەکی‌کەدا ، دوو ئەرك نابینێ •

وشە جامیدەکە هیچ‌پەیدایی ناگەیەنێ ، پاشگرەکە تەکاتێکی پێ‌دەداو شەحنی دەکا ، وەك ( قۆرِە + اندن = قۆرِاندن ، قۆرِاندی ) لێرەدا پاشگرەکە ئەرکی خۆی بینی‌و کارەکەش لە قۆناغی تێنەپەرِدا دەمێنێتەوە ، خۆ ئەگەر وشەکە لەخۆیدا رووداني تێدا هەبوو ، پاشگرەکە دەوری شەحن نابینێ‌و بە بارێکی‌کەدا تەکانی پێ‌دەداو دەی‌کا بە تێپەرِو هیچی‌دی ، وەك ( مردن + اندن = مراندن ، مراندی •••• ) •

جا ئەوانەی‌کە دەڵێن : ( وێنەی قڕاندن ـ باڕاندن ـ قاچاندن ••• ) لە چاوگی ( قڕان ـ باڕان ، قاچان ••• ) دادەبەزن‌و ئەوانیش مردەچاوگن ، زۆرباش زەینیان ترازاوە ؛ چاوگی ( قڕان ، قاچان ، پیتان •••• ) • ساختەو رووکەشن ؛ نە دایکەن‌و نە ریشەیین •• وێنەی ( باڕاندن و گرماندن ) یەكسەر لە ( بارە و گرمە ) وەرگیراون ، لە ـ باڕان ، گرمان ـ ەوە سازنەدراون • بە بڕوای من چاوگی مردوو یان کوێرەوەبوو وەك بۆی دابەزیون ، بەو بۆچوونەی من هەڵدەوەشێتەوە •

ماوەتەوە خاڵێکی دژوار : بۆچی ئەو نموونە تێنەپەڕانە بە هۆی ( اندن ) ەوە راناوی تێپەڕ وەردەگرن ؟

من وای بۆ دەچم کە پاشگرەکە لە شەحندا بەتەوژمەو لەگەڵ کاری یاریدەدەری ( کردن ) دا سەوداو مامەڵەدەکاو کارا ، دەکا بە خاوەنی وشە جامیدەکە ، کە بە عەرەبی پێی دەڵێن ( الصّیرورة : جعل الشیء صاحبَ أصله ) • کورد کە دەڵێ : ( گرماندی ـ قڕاندی ) جیاوازیی نیە لەگەڵ ( گرمەی کرد ـ قڕەی کرد ••• ) •

لە ئەم دەربازگەیەوە وەك جۆرە تێپەڕێك رەفتاریان لەگەڵدا دەکرێ •

ب ـ بەپلەی دوەم شەحن‌و نماییش بە پاش‌گری [ ەوە ] :

بەپێی خاسێتی کاری شێنەیی ، ئەمیش وەك [ اندن ] دەوری خۆی دەبینێ •

بە نموونە ( زرینگە ) ناوەدەنگە ، لەگەڵ پاشگرەکە دەچێتە قالبی چاوگی ئەلفی / یەوە : ( زرینگانەوە ) ئنجا گەرداندەکا ، وەك : ( زرینگایەوە ، دەزرنگێتەوە ، بزرنگێرەوە •••• هتد •

بەلاَم نمایشی خاوبوونەوە ، بە ( اندن ) ی تەکانهێن ، دەستنادا ، وەك :

( لاڵ ، لاڵە ) نایێتە ( لالاَندن ، لالاَندی ... ) چونکە رووداتەکەی ( بە چەشنی حەپە ، حەپاندی ) تەکاندارنیە ، بەلاَم بە پاشـــگری [ ەوە ] دەکەوێتە گەردان ، وەك : ( لالاَیەوە ، دەلالێتەوە ... ) .

دیسان لـە وێنەی ( حەپـە ، لوورە ) دا ، نابێژرێ : ( حەپـایـەوە ، دەبۆلێتەوە ) بەلاَم دوای شەحنبوونیان بە ( اندن ) پاشگری [ ەوە ] ش وەردەگرن ، وەك : ـ حەپاندیەوە ، بۆلاَندیەوە ـ .

لەم حەلەدا ، پاشگری [ ەوە ] چ جۆرە ئەرکێك‌دەبینێ ؟

لە بەرەنجامیەوە وا دەردەکەوێ کە لە دوای ( انـدن ) ەوە نمایش و خاوبوونەوە راناگەیـەنێ ، تەنهـا بۆ دووبـارە دەبێ ، وەك : ( ورچەکە بۆلاَندیەوە = دووبارە بۆجارێکی‌کە بۆلاَندی ) .

لێرەدا دەستوورێك هەڵدەهێنجین :

أ ـ ئەو وشانەی‌کە بە ( اندن ) دەکـەونـە گـەردان ، بۆ مەبەستی دووبارەنەبێ ، پاشگری [ ەوە ] وەرناگرن ، چونکە سپاردەی شـەحنەکە بە ( اندن ) جێبەجێ بووە .

ب ـ پاشگری [ ەوە ] دەکەوێتە دوای ( اندن ) ەوە .

لە هەندێ کاردا هەمان دەوری ئەو دەبینێ واتە شـــەحنو جولاَنی وشەکەو گورِپێدا هێنانەوەی بە رووداتو پەیدایی .

لەو مامەڵەو بەراوردەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هێلانەی پاشـــگری [ ەوە ] دواوەی وشەیەو هەر لە ئێستاوە ناوی پاشگر ، نەك پێشگری بـە بالاَ دەبرِین .

بۆ باری دڵنیـــایی‌و پاساودان ، ئەوا ئەم خشـــــــتەیەی خوارەوە دەخەمەروو :

| ڕووداني شێنەیی به شەحنی [ ەوە ] | | شـــەحن بە [ اندن ] | | جووڵاو بە [ اندن ] + [ ەوە ] | |
|---|---|---|---|---|---|
| سادە | لێکدراو | سادە | لێکدراو | سادە | لێکدراو |
| خولایەوە | هەڵوەشایەوە | خولاندی | هەڵیوەشاند | خولاندیەوە | هەڵیوەشاندەوە |
| رشایەوە | هەڵکشایەوە | رشاندی | هەڵیکشاند | رشاندیەوە | هەڵیکشاندەوە |
| کزایەوە | تێ‌شکایەوە | ——— | تێی‌شکاند | کزاندیەوە | تێ‌شکاندەوە |
| لاڵایەوە | هەڵسووڕایەوە | ——— | هەڵیسووڕاند | ——— | |
| پلیشایەوە | وەرچەرخایەوە | پلیشاندی | وەریچەرخاند | پلیشاندیەوە | هەڵیسووڕاندەوە |
| زرینگایەوە | داچۆڕایەوە | ——— | دایچۆڕاند | زرینگاندیەوە | وەریچەرخاندەوە |
| پاڕایەوە | ——— | ——— | ——— | ——— | ——— |
| ——— | ——— | بۆڵاندی | ——— | بۆڵاندیەوە | ——— |

خشـــتەی ژمـــارە - ٧ -

تێبینی :

لەوەپێش درکاندم کە ئەو کارانەی لە خێڵی سـێیەمن هەروەها بـە ئاسانی ناوی مردە چاوگیان لێ نانرێ ؛ زۆرینەیان کە لە بەراییەوە دابەزیون لەخۆیاندا بێپەیدایین ، کە بێپەیدایش بوون ، بەرووتی ناکەونەگەردان.. دوای شـەحن بوون چالاکانە دەجوولێن ، ئەوانەیان کـە بە [ اندن ] گوڕپەیدادەکەن دەچنە قاڵبە چاوگی دالیەوە ، وەك : ( مشە ـ مشاندن ) ئیدی فەرزی چاوگە ساختەی ( مشـان ) ی ناوێ ، تاوەکو بڵێین چاوگی ( مشان ) کوێرەوەبووە .. !!

ئەوانەشیان‌کە بە پاشگری [ ەوە ] نمایش‌دەکرێن ، وەك دەستوورێکی چەسـپاو لە زمانەکەماندا ، بە پاشـگرەکەوە لە قاڵبە چاوگدا خۆی دەچەسپێنێ ، وەك : ( تـەقـە ـ تەقین + ەوە = تەقینـەوە ) یـان ( لاڵ ـ لالآنەوە ) ئەگەر ئەو قاڵبەیان ـ دوای لکانی پاشگرەکە ـ بۆ سازنەدرێ ، بنکەی گەردان بۆ کـارو ئـاوەڵنـاو پـەیـدانـابێو دەبێتـە مـایـەی ئاژاوەگەردانی = الفوضى في التصريف .

چوونە بنجوبناوانی وشەی ناپەیدایی‌و شەحن بوونیان سـۆراخێکی هێمنانەو زانستانەی دەوێ .. هەندێ وشـە لە هەرێمێکدا نامۆیەو لـە هەرێمێکی‌کەدا هۆگرو بەگوڕە .



لەبەرئەوەی‌کە یەکالآی ئەوجـۆرە نەێنیە زمانیـانـە ، تۆبەرەنو زوو پێ‌ئاشنابوونیان ستەمە ، نموونەیەکی گەردانو شـەحن لە زمانێکی‌کـەدا دەهێنمەوە :

دەستەمۆی وشەی جامید لە هەڵکەوتی زمانی عەرەبیدا ، بە خوازەو کێشی تایـەتی کارێکی بێدەمـەقـاڵیـە .. بـە نموونـە بـەردی رەقو

ناپەیدایی « حَجَرْ » دەیخەنە قالبی ( تفعیل ) ەوە ( حجّر ) یان دەیخەنە کێشی ( تَفَعّل ) ەوە ، وەك ( تحجّر ، یتحجّر ) •

دواتر ( دەرزی و تەقەڵ ) بە کێشی تایبەتی گەردانیان پێدەکەن ، وەك[115] : ( یدرُزُ ، یتّکل = دەرزیو تەقەلی ، لێ دەدا ) •

بەڵام لە کوردیدا شەحن و بزاوتنی کار بە هۆی پاشگری [ ەوە ] دەورێکی زۆر ناسکی هەیە •

وەك شاشە تایبەتو چۆنێتیی کارەکە دەنوێنیو بە هەستو بیردا رای دەگەیەنێ !!

ئەو تایبەتە زمانیە مۆرکی رەسەنێتیی زمانی کوردیە ، موعجیزەی خودی ئەم زمانەیەو بیرتیژو شیرەزای کورد نەبێ بۆی دیاردی ناکرێ ؛ لە ئەنجامی نابەراوردانەوە ، ئەو تاقە ئەرکە چەواشەبووە ، ناوی هەشت نۆ ئەرکی جیاجیای بەیەکداچوو سەریان هەڵداوە ، یان بە لێدانەوەیەکی دیکە لە پەی پێنەبردنەوە تاقە ئەرکێکیانی کراوە بە دەو پتر !!



❋ شیکردنەوەی چەند کارێك کە هەر ئەوەندەیان دەربارە گوتراوە : « بەبێ پاشگری [ ەوە ] بەکارنایەن و بێواتان » •

**١ - بریسکە :**

تایبەتو خاسێتەکەی راگەیاندنی کارتێکراتێکی تیشکیە ، لەبەرئەوەی کە ئەنجامی شەوقدانەوەیە هەرچەندە سستیش بێ بەبێ پاشگرەکەش دەجوولێو گەردانیدەکا ، وەك ( بریسکا ، دەبریسکێ••• )

---

(١١٥) بۆ کتێبی - ئابووریی ماڵەوانی / بۆ ئامادەیی کچان/چاپی ١٩٧٣ . خۆم ئەندامێکی کارا بووم لە وەرگێڕانیدا بۆ کوردی .

بەلاّم بە هۆی پاشـــــگرەکەوە زەقتردەبێتەوە ، وەك : ( بریـــــکان ـ بریسکانەوە ) •

**٢ ـ پلیشـــان ـــ پیلشـــانەوە :**

ئەم چاوگەش بە سادەیی گەردان‌دەکا • وەك ( پلیشـا ، پلیشـاوە ، دەپلیشێ ••• هتد ) •

ئەگەر ( واتەنی ) لێم نەسەلمێنرێ ، پەنادەبەمە بەر بورهانێکی‌دی :

ـــ کاری پلیشان ـ پلیشـــا ـ بە هۆی پاشگری ( اندن ) دەبێتە تێپەڕێکی بەهێز ، وەك : ـ پلیشاندم ، پلیشاندمان ، جووجەڵەی پلیشاند ـ بێتو کار لە خۆیدا تێنەپەڕنەبێ ، نابێتە تێپەڕ ، کە تێنەپەریش بوو ئـەوا لە گەرداندا بەگوڕە •• ئەمەیان ئاشکرایەو چەندوچۆنی ناوێ •

لەبەر ئەوەی‌کە ڕوودانی کارەکە بەرەبەرەیەو تەکاندارنیە ، پاشگری [ ەوە ] باشتر نماییشی دەکا ، وەك : ( جووجەڵەکە لە ژێر ســەوەتەکەدا ، یان لەبەر پێدا ـ پلیشایەوە ) •

**٣ ـ پـاڕانـەوە :**

بەرووتی‌و لە روخساری چاوگە رواڵەتیەکەدا : « پاڕان » لێ‌کۆڵینەوەی دەوێ ، لەبەرئەوەی کاری یاریدەدەرنیە دەبێ بە یاسای چەسپاو بە ( اندن ) شەحن‌بێ ، کەچی ناگوترێ « پاڕاندی » لەســــەر باوی « قاچاندی » واتە : رای‌کرد •• ئاشکرایە کە لە وشەی ( قاچ ) ی جـامیدەوەیـەو بـە یاریدەی ( اندن ) کەوتوەتە گەردانێکی ڕاست‌و دروست • دەبێ نهێنییەك هەبێ کە ناگوترێ ـ پاڕاندی ـ ؟!

بەم‌چەشنە باری سەرنجی دەدەمێ :

أ ـ دەلوێ کـە لە دەنگەناوی ئاژەڵەوە ، دابەزی بێ : ـ باڕەباڕ ـ واتە بە فۆنێمی / با ••• با ••• / لەم‌حەلەدا بە هۆی ( اندن ) دەجووڵێ‌و

تێنەپەڕە ⟵ بزنەکە باڕاندی •

بەچەشنی :ـ گورگەکـە لوورانـدی ، بەڵام ناگوترێ : ( باڕایەوە ، لوورایەوە ) چونکە ڕوودانەکەیان تەکانداره • کەچی دوای شەحنیان بـە ( اندن ) بۆ مەبەستی دووبارە ، بە زوڵاڵی دەگوترێ :

( باڕاندیەوە ) •• بەو پێیە قاڵبی ( پاڕان ) ڕواڵەتیەو بنجی نیە ، دوای ئەوە بە خوازەکاریو بۆ نمایشی مەردومێکی بەستەزمانی هانابەر دابەزیوە، دەنگی [ پ ] جێگەی دەنگی [ ب ] ی گرتوە ، دوای سازبوونی فۆنێمی ( پا = با ) • ئەم گۆڕینەدەنگەش لە زمانەکەماندا ئاســــــاییە ، وەك : ( بچووك = پچووك ، پکەم = بکەم ••• هتد ) • بە هێواشی پاشــگری [ ەوە ] وێنــەی ڕووداوەکــەی گرتــوەو ( پاڕانــەوە ، دەپاڕێتــەوە ) ی لێکەوتوەتە گەردان لێرەدا سووسەی ئەوەمکرد ، کە ئەو وشـە بەراییە بـە خوازەو مەجاز دابەزیوە • لە هەمان دەربازگەوە بۆ وێچوونێکیدی •••

ب ـ ڕێی تێدەچێ کە وشەکە لە ( پا + ڕان ) ەوە دابەزیبێ ؛ ئەمیش لە دیمەنی ئەو کەســەدا دەردەکەوێ کــە هانادەباو بەپاوە دەوەســــتێو بەنووچادێو دەست بەچوکیدا دەهێنێ •• یان دەخالەت دەباو شاڵاو بـۆ قاچوڕانی ئەموئەو دەهێنێ ، لەم حەلەدا پاشگرەکە ، خاوکەرانە بیچمەکەی رادەگەیەنێو قاڵبێکی نمایش نامە دەسازێنێ •

بــە هەرحاڵ ئەوانــە باری ســــــــەرنجمنو ، وێچوونی یەکـــەم : ( پاڕان = باڕان ) بە بەهێزتری دەزانم •

لە لایەکیکەشەوە ئەوەندەی پاشگری ( اندن ) لە شـــــــــەحنی پەیداییدا ، بەگوڕە ، ئەوەندەش پاشــــگری ( ەوە ) لەنواندندا ئامێرێکی ئەفسوونیە !!

٤ ـ لاڵ ــ لاڵانەوە :

گومان لەوەدا نیە کە بنجە سادەکەیان بێپەیداییە ، دارێژراوەکەش بۆ نواندنی کردەوەی ئەو کەسەیە ، کە بە زەبوونیەوە لـە بەردەمی یەکێکدا دەپاڕێتەوە ، بە چەشنی کەڕو لاڵێك کە بە زبان هەســــتو نەســــتی بۆ دەرنابڕدرێ •• بە تێندانو موعاناتەوە دەکەوێتە گاڵەگاڵ و ئەندام بزاوتن، تا بەرانبەرەکەی تێدەگەیەنێ ، لەم واتا بەراییەوە دابەزیوە بۆ واتایەکی باو کە پەیوەندییان ناپسێتەوە •

نواندنی ئەو کارە بە خوازەکاریەوە تەنها لە کێشی پاشگری [ ەوە ] دایەو بە تەکانپێدانی ( اندن ) لاساییناکرێتەوە •

ئەم وشــەیە وا هۆگر بووە کە لە هەندێ دەســـتە شـێوەدا بەبێ [ ەوە ] ش ، بـەکـــار دەهێنرێ ، وەك لــە هـەورامیـــدا : ( ملاڵا = دەلاڵایەوە ) •••

« ئەو شــەو تــا بـە سوب هەر مژەندن ساز
خەسرەو ـ ملاڵا ـ شـــــیرین مکەردناز »
« خانای قوبادی »

٥ ـ رشـــان ــ رشـانەوە :

گوایە ئەمیش بەتەنێ بێواتایە ، بەلاّم بە ســـادەییش گەردانندەکا : ( رشا ، دەڕشێ •• ) چاوگێکی ریشەییەو تێنەپەڕە و بەهێزە دەنا بە هۆی ( اندن ) نایێتە تێپەڕ ، تا قۆناغی تێنەپەڕی نەبڕیبێ •

ئەگەر بشگوترێ : ( رشاندی ) لە کوێو ( رشایەوە ) لە کوێ ؟
بە دڵنیاییەوە دەڵێم :ـ

دوورکەوتنەوە دەنگسازیەکە ئەوەندە ســــــەختنیە هەر کامێکیان بگرین لە ماکی ( رژان ) دەرناچێ ، جا ـ رژانەکە لە لوولەی مەسینەوەبێ

یان له بۆریی قورگەوه بێ •• شلەکەش هەر شلەیەك بێ خەست بێ یـان تراوبێ •• له رەنگیشدا هەرچۆنێ بێ •••

تایبەتی کاری تەکاندارانەنیەو خاوکارانەیەو له ئەستۆی پاشگرەکەیە، لێرەش‌دا دەنگی [ ژ ] گۆڕاوه بە دەنگی [ ش ] لادانی دەنگه بنجیـەکـە بووەته هۆی ئەوەی‌که له گەرداندا سست‌بێ‌و کاری ( رشـــا ، دەڕشێ )، وەك ( ڕژا ، دەڕژێ ) گەردان‌نەکا(١١٦) •

* ئەگەر بۆ باری سەرنجیش‌بێ ، یەکالای ئەو خێلە وشـەیـە بـە تـاوی جووتـە مۆرفێمی ( انـدن ) و [ ەوە ] لـە چـەنـــد روویەکـــەوە سوودبەخشن :

١ ـ مەزنایەتی‌ی پاشـــــگری [ ەوە ] لـە شـــــەحن‌و نواندنی روودانی شێنەییدا •

٢ ـ بێتو لـە ئـەو ئەرکه ســـــــەرەکیە بترازێ تەونی زمـانی کوردی هەڵدەوەشێتەوە •

٣ ـ گێڕانەوەی دەیان‌و پتر له وشەی زمـانـەکەمـان و گێڕانەوەیان بۆ هەوارگەی خۆیان •

٤ ـ کۆمەڵەی دەنگەناو و روخسارەنـاو ، دوای شەحن‌بوون ئنجا دەچنە قالبی چاوگەوەو دەکەونەگەردان • نەك بە پێچەوانەوە •• وەك بۆی رۆیشتون •

---

(١١٦) رشـــــــان = رژان : بـە گۆڕانـە دەنگ‌و خـوازە ، بـۆ روەکیش بەکاردەهێنرێ ، وەك : « مێوەکـــە رشـــــاوەتەوە » واتـــە دوای پۆخ‌کردنی‌و ســـەرەتای هەڵپێچانی بەرســـــیلەکەی ، قۆزاخەکەی دەتروو کێ‌و هەڵدەوەرێ •

٥ ـ دەوری رەوانبێژیو فیلۆلۆژی لـە دابەزینی وشـەی بەرایـداو نواندنیان بە هۆی پاشگرەکەوە •

٦ ـ سۆراخی وشەو دەوری سستیو چالاکییان ، بەپێ بەکارهێنانیان : لە ئەم هەوارگەوە بۆ ئەو هەوارگە ••



# دوا ئەنجام

**ا ـ لە رووی فەبارەوە :**

١ ـ نیشانەی کاری رابوردووی نزیك ، دیاردەیەکی رەسـەنی کوردیە ، بەتێکڕای « وە » •

٢ ـ پاشکۆی ئامرازی پەیوەندی تێکڕا بنجیەکەی بریتیە لە [ ەوە ] •

٣ ـ مۆرفێمی دووبارە ـ بەچاوپۆشین لە هەڵچەرخانەوەی لـە تێکڕای [ ەوە ] دا خۆی ساغدەکاتەوەو پاشگرە •

٤ ـ نیشانەو پاشگرەکە ، سەربە وشەسازین ••• نزیکە روخسـارو دوورە ئەرکن •

٥ ـ پاشکۆ ئامرازەکەو پاشگرەکە هاوقەبارەنو ئەویان سـەربە رستە سازیەو ئەمیان سەربە وشەسازیەو لەسـەرەتای ئەم قۆناغەدا لێکم جیاکردنەوە •

٦ ـ لە رووی ئاشکراکردنی کارو زەقکردنەوەی پەیدابیـەوە میـانەیـان هەیەو بە یەکسانی ئامرازی تابینا وەردەگرن بە تایبەتی لەکرمانجیی نێوەڕاستدا •

ب ـ له رووی ئەرکەوە :

١ ـ دووبارە بوونەوە •

٢ ـ گەڕانەوە بۆ دواوە •

٣ ـ شەحنی وشەی ناپەیدایی‌و بە روودانی شێنەیی‌و بەردەوامی •

٤ ـ نمایش‌و نواندن •

٥ ـ گۆڕینی واتای وشە بە هاو دژایەتی « تضاد » •

٦ ـ کردنی قەدە چاوگ بە چاوگەناو •

**دواییــنـه :**

ئەم هەوڵەی منیش ئەمپەڕاوپەڕ نیە ، باسەکە لەخۆیدا بەشوێن‌کەوتنی نیشانەیەك‌و پاشگرێکی تایبەتی زمانی‌کوردیەو چڕو زەبەندە •• بەڵام لـە یواری مۆرفۆلۆژیداو بە خواســـتی لێ‌کۆڵینەوەی بەراوردانە ، کارێکی نۆبەرەیە لە رێزمانی کوردیدا •••

زۆر رەتاوم لە بەڵگەکاریــدا و لە گوڵزاری ئەدەبیــاتی کۆن‌و تازەی سەرتاپای شێوەکانی کوردیدا نموونەکانم دەســــتچن‌کردن‌و هەوار بـە هەوار بەراوردم تێداکردن •••

•• هەمووشی لە پێناوی خەملاندنی ئەو زمانە ئەدەبیەیە کــە زادەی مێژوویەو بۆمان رەخساوە •••

لە روانگەی پاشگری [ ەوە ] وە بۆ یەك‌بوونی زمانێك‌و یەك‌بوونی نەتەوەیەك •••

دواگوتەم ⋙← بڕوام‌وایە ، کە زمان دۆست :ـ

« بـە تاقـە یـەك زاری شـــیرین
شـــاخ پڕ ئەکـا لـە پێ‌کەنین »
ـ گۆران ـ

★ ★ ★

---

**دوانیگا :**

بۆ دوەم جار نووسینەوەو پێداچوونەوە لە شەوی ٢٧/٤/١٩٨٠ ـ دا کۆتاییم پێ‌هێنایەوە •

# سەرچاوەکان


١ ـ گۆڤارەکانی کۆڕی زانیاری کورد :

أ ـ گۆڤاری ژمارە ـ ١ ـ ١٩٧٣ ٠

ب ـ گۆڤاری ژمارە ٢ ب ١ ـ ١٩٧٤ ٠

ج ـ گۆڤاری ژمارە ٢ ب ٢ ـ ١٩٧٤ ٠

د ـ گۆڤاری ژمارە ٣ ب ١ ـ ١٩٧٥ ٠

هـ ـ گۆڤاری ژمارە ٤ ـ ١٩٧٦ ٠

و ـ گۆڤاری ژمارە ٥ ـ ١٩٧٧ ٠

٢ ـ ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی چاپی کۆڕ ١٩٧٦ ٠

٣ ـ وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانیکوردی مەسعود محەمەد / چاپی کۆڕ ـ ١٩٧٤ ٠

٤ ـ چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی مەسعود محەمەد / چاپی کۆڕ ـ ١٩٧٦ ٠

٥ ـ ئاواو دەستورا زمانێ کوردی / جگەر خوێن ـ بەغدا ١٩٥٨ ٠

٦ ـ ڕێزمانی کوردی / نوری عەلی ئەمین / سلێمانی ـ ١٩٦٠ ٠

٧ ـ گرتنی کەلێنێکی‌تر لــــە رێزمــانی کوردی / نوری عــەلی ئــەمین ـ بەغدا ـ ١٩٥٨ ٠

٨ ـ قواعد اللغة الكردية / العلامة تۆفیق وەهبی ـ بەغداد ١٩٥٦ ٠

٩ ـ مختصر صرف و نحوی کوردی ، جزء ـ ١ ـ سەعید سدقی ـ ١٩٢٨ ٠

١٠ـ رێزمانی کوردی بۆ پۆلی پێنجەم‌و شەشەمی سەرەتایی/چاپی ١٩٧٦٠

١١ـ زمان‌و ئەدەبی کوردی / بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی / چاپی ١٩٧٦ ٠

١٢ـ زمان‌و ئەدەبی کوردی / بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی ـ چ ١٩٧٠ ٠

١٣ـ زمان‌و ئەدەبی کوردی / بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی چ ١٩٧٦ ٠

١٤ـ رێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم / ئەحمەد حەسەن / بەغدا ، ١٩٧٦ ٠

١٥ـ وشە ڕۆنان لە زمانی کوردیدا / دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف / ١٩٧٧ ٠

١٦ـ زمانی یەك‌گرتووی کورد / دوکتۆر جەمال نەبەز چ ١٦/٦/١٩٧٦ ٠

١٧ـ ســــــەرنجێ لە زمــانی ئەدەبی‌ی یەك گرتووی کوردی / دوکتۆر عیزەدین مستەفا ـ چ ١٩٧١ ٠

١٨ـ فۆلکلۆری کوردی / لێکۆڵینەوەی ـ د٠ عیزەدین مستەفا ـ ١٩٧٠ ٠

١٩ـ چاوگی بێ‌واتا لە زمانی کوردیدا / دوکتۆر نەســــــرین فەخری ـ چ ١٩٧٣ ٠

٢٠ـ سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی‌ی زمانی کوردی / محەمەد ئەمین هەورامانی ـ چ ١٩٦٠ ٠

٢١ـ فەرهەنگی خاڵ ـ جزمی یەکــەم ، چاپی یەکــەم / شــێخ محەمەدی خاڵ ـ ١٩٦٠ ٠

٢٢ـ فەرهەنگی مەردۆخ / جلد أول •
٢٣ـ کوردستانو کورد / د• قاسملو ـ ١٣٥٢ •
٢٤ـ کوردو کوردستان / محەمەد ئەمین زەکی •
٢٥ـ دەفتەرەکانی کوردەواری :
ژمارە ١ ـ ١٩٧٠ بەغدا
ژمارە ٢ ـ ١٩٧٠ بەغدا
ژمارە ٣ ـ ١٩٧٠ بەغدا
٢٦ـ گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ، زانستگای بەغدا / ژمارە : ١٧ / و ٥ ١٩٧٢ ـ ١٩٧٤ •
٢٧ـ پەندی پێشینان / شێخ محەمەدی خاڵ ـ چاپی دوەم ، سلێمانی ، ١٩٧١ •
٢٨ـ القواعد الاساسية لدراسة الفارسية / الدكتور ابراهيم أمين الشواربي ـ ط ٤ •
٢٩ـ دستور جامع زبان فارسى ، هفت جلد در يک مجلد / عبدالرحيم همايونفروخ ، تهران ١٣٢٤ هەتاوی •
٣٠ـ فرهنگ طلائى / الدكتور محمد التونجي ـ بيروت ـ ١٩٦٩ •
٣١ـ گلستان سعدى / المكتبة العربية ، بغداد •
٣٢ـ ديوان بابا طاهر عريان / وحيد دستگردى ، چـ ١٣٤٤ ـ هەتاوی •
٣٣ـ فرهنگ عميد •
٣٤ـ برهان قاطع •

٣٥- اللغة والفكر / الدكتور نوري جعفر - رباط ، ١٩٧١ .
٣٦- فقه اللغة المقارن / الدكتور ابراهيم السامرائي .
٣٧- اللغة الشاعرة / عباس محمود العقاد .
٣٨- أصوات واشارات في علم اللغـة / تأليف ( أ . كوندراتوف / ترجمة أدورد يوحنّـا ، بغداد ، ١٩٧١ .
٣٩- جواهر البلاغة / السيد أحمد الهاشمي - مطبعة حجازي ، ١٩٥٤ .
٤٠- رسالة الوضع ( المخطوطة ) للعلامه أبو بكر مير رۆستمي .
٤١- ڕەنگی گێتیی تازە ژمارەو بەرگ :
١ - ٢ ، ١٩٤٤
٢٥ - ٢٦ ، ١٩٤٦
٥ - ٤ ، ١٩٤٥
٤٢- کۆمەڵەتێکستی فۆلکلۆری کوردی پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆیێف / بەغدا ، ١٩٧٦ .
٤٣- تحفەء مظفریە بە زمانی کوردی - موکری ، کرداری ئۆسـکارمان / بەغدا ، ١٩٧٥ .
٤٤- شـــیرین و خەسرەوی خانای قوبادی / ساغکردنەوەی محەمەدی مەلا کەریم - بەغدا ، ١٩٧٥ .
٤٥- دیوانی نالی / لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمو فاتیح عەبدولکەریم بەغدا ، ١٩٧٦ .
٤٦- دیوانی مەحوی / لێکۆڵینـەوەی مـەلا عەبدولکەریمی مودەڕریسو محەمەدی مەلا کەریم / بەغدا ، ١٩٧٧ .

٤٧ـ ديوانی نالیو فەرهەنگی نالی / ساغکردنەوەی دوکتۆر مارف خەزنەدار ـ چ بەغدا ، ١٩٧٧ ٠

٤٨ـ ديوانی مەولەوی / لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەرریس ، ١٩٦١ ٠

٤٩ـ ديوانی صەيدی / کۆکردنەوەی محەمەد ئەمین کاردۆخی / سلێمانی ١٩٧١ ٠

٥٠ـ عەبدوڵلا بەگی میسباح دديوان / ساغکردنەوەی دوکتۆر مارف خەزنەدار ـ چ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ٠

٥١ـ تاريكوڕوون / هێمن ، ١٩٧٤ ٠

٥٢ـ مەلای گەورە / مومتاز حەیدەری ـ هەولێر ، ١٩٧٥ ٠

٥٣ـ ديوانی مەندەلاوی [ پڕوەخێن ] کەرکوك ، ١٩٧١ ٠

٥٤ـ مەلای جەباری / کۆکردنەوەی عبدالجبار محمد الجباري / کەرکوك ، ١٩٦٨ ٠

٥٥ـ مەهدی نامەی ـ ابن حاج ـ لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی / بەغدا ، ١٩٧٥ ٠

٥٦ـ عەقیدەی مەولەوی / ئامادەکردنی محەمەد عەلی قەرەداغی ـ ١٩٧٧ ٠

٥٧ـ بەرگی ـ ٣ ـ لە پەندەکانی پیرەمێرد / کۆکردنەوەی کاکەی فەلاح ، ١٩٧٢ ٠

٥٨ـ ديوانی بێخود / بەشوێن کەوتنی ، محەمەدی مەلا کەریم ـ بەغدا ، ١٩٧٠ ٠

٥٩ـ حاجی قادری کۆیی / مەسعود محەمەد چاپی کۆڕی زانیاری ١٩٧٢ ٠

٦٠- نووبهارا سەیدایێ مەزن ئەحمەدێ خانی / سادق بەهادین ، ١٩٧٩ ٠
٦١- ئیدیەمێت کوردی / سادق بەهادین ، چاپی کۆڕی زانیاری ١٩٧٣ ٠
٦٢- گۆڤاری گەلاوێژ - ژ ٦ - سالی ٥ - ١٩٤٤ ٠
٦٣- بەهەشتو یادگار - فرمێسكو هونەر - گۆران ، سلێمانی ١٩٧١ ٠
٦٤- هەندێ لە زنجیرە نووسینەکانی خۆم :
أ - چەنـد تێبینییەك دەربـارەی ڕێزمـانی کوردی ( ١٥ ) ئەلقە / ڕۆژنامەی ڕاپەڕین ، ئەیلوولی ١٩٦٧ ٠
ب - چەند گوتارێکم لە ژمارەکانی گۆڤاری ( دەنگی مامۆستا ) دا ، ١٩٧١ ٠
ج - ی - لە زمانی کوردیدا - ٣ - ئەلقە / ڕۆژنامەی ژین - ١٩٧١ ٠
د - ئامرازی ئیزافە / گۆڤاری برایەتی ، ژمارە - ٩ - ١٩٧١ ٠
هـ - پیادەگەشـتێكو چەند تایبەتێکی زمانی کوردی لەمەیدانی وەرگێڕاندا ، دەستنووس ٠
و - دەوڵەمەندکردنی زمانە ئەدەبیەکەمان / دەستنووسی - ١٩٧٦ ٠
ز - گەشـت نـامـەکـەم بۆ کۆکـردنـەوەی - فۆلـکلۆرو داستانەکوردیەکان ١٩٧١ ، ١٩٧٢ ، دەستنووسی ٠
ح - زنجیرە ڕەخنەکـانم دەربارەی کتێبـە ڕێـزمـانـەکـانی قۆناغی ئامادەیی و نێوەندی / ڕۆژنامەی ژین ١٩٧١ - ١٩٧٢ ٠

**کۆتایی**

الجمهورية العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
سلسلة اللغة (٤)

# نقاشات في قواعد اللغة الكردية

رؤوف احمد ئالانى

توزيع الدار الوطنية
تصميم الغلاف شكر جاسم
دار الحرية للطباعة
السعر ٢٥٠ فلساً